# بەرەو 11



گۆڤارێکی
بواری
پەرەپێدانی
مرۆیی گشتییە
حوزەیرانی
2013



## ناڵەشکێنە

## لە عەقڵیەتی فەردیەوە بۆ دامەزراوەیی

## دزی خەونەکان

## ئامانج وکاریگەری لەژیانی مرۆڤدا

## چۆن پەیوەندیەکی کارا دروست دەکەین؟

## نامەوێ ببمە بکوژی منداڵەکەم

## منداڵ و پشووی هاوین!

# بەرەو


گۆڤارێکی بواری پەرەپێدانی مرۆیی گشتییە

ژمارە (11) حوزەیرانی 2013










ناردنی بابەت و پەیوەندییەکان لەڕێگای سەرنوسەرەوە دەبێت.

نرخی 2500 دینارە

دیزاین گۆڤاری بڕیار

هەولێر- شەقامی ئیسکان بەرامبەر ڕاین مۆڵ

# با گفتوگۆکانمان وەك گوڵ وابن!!!

پێشینان راستیان فەرمووە مرۆڤ سندوقی داخراوەو کلیلەکەشی زمانیەتی، چونکە زمان ئامرازی ئاخاوتن و گفتوگۆکردنە، کاتێك گفتوگۆدەکەین ئەوا دیدو بۆ چون و بەهاو رەوشت و تێروانینێك کە لە ناخماندایە دەری دەبڕین.

لەم سەردەمەی کە ژیانی مادی باڵا دەستە ئەوا زیاتر پێویستیمان بەگەشەی گیانی و رەوشتی هەیە، ئەمڕۆ لەهەر کاتێکی تر زیاتر پێویستیمان بەگفتوگۆی ناسك و جوان و هێمن و ئارام هەیە لەسەر ئاستی خێزانی و کۆمەڵگادا دوور لەگفتوگۆی مادی کلاسیکی.

لەم دەست پێکەدا دەخوازم جەخت لەسەر گفتوگۆی خێزانی بکەمەوە کە لە نێوان ژن و مێردوو منداڵەکانیاندا دێتە ئاراوە، پێویستە بەئاراستەیەکی باش و تەندرووستدا گوزەر بکات تا بەرهەمدار بێت و خۆشی و ئاسوودەیی ببەخشێتە تاکەکانی خێزان.

بۆ ئەوەی گفتوگۆی خێزانی رەونەقدارو جوان بێت، پێویستە رەچاوی دوو خاڵی سەرەکی بکەین:

یەکەم: دیارە گفتوگۆکردن لەنێوان دوو کەس یان زیاتر، واتە جۆرێك لەجیاوازی لە راو سەرنج و بۆچوندا هەیە، گەر دووکەس پێکەوە بدوێن و هیچ را جیاییەکیان نەبێت ئەوا ئاخاوتنەکانیان بریتیە لەپەیوەندی و سەردانی ئاسایی.

لە گفتوگۆی خێزانیدا دەشێت جیاوازی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا هەبێت لەسەر بابەتێك یان پرسێکی دیاری کراو، دەخوازن بگەن بەچارەسەرێکی گونجاوو تێروانینێکی هاوبەش و لەهەمان کاتدا مەبەستیانە پەیوەندی خێزانیان پتەوو بەهێز بکەن و بوونی جیاوازی نەبێتە مایەی لاوازی پەیوەندیەکانیان و لێبووردەیی و سۆزو خۆشەویستی و رێز باڵ بکێشێت بەسەر ئەندامەکانی خێزانەکەدا.

لێرەدا پێویستە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا بە تایبەت دایباب دەستەواژەو شێوازی ناسك و جوان و واتابەخش بەکاربێنن و وشەی زبروو برینداركەرو ناشیرین خۆیانی لێبەددوربگرن، رەچاوی هەست و سۆزی بەرامبەرەکەیان بکەن و بە رووگەشی و رۆخۆشیەوە بدوێین.

دووەم: جوانی و شیرینی و ناسکی زمان رەنگدانەوەی جوانی روحوگیانە.

ئەوانەی وشەو دەستەواژەی زبرو بەکاردێنن ئەوا دەروونێکی خاوێن و پەروەردەکراویان نیە.

گفتوگۆی جوان و وەنەوشەیی پشت بە دەربڕینی ناسك دەبەستێت و بە بڕبڕەی پشتی گفتوگۆی سەرکەتوو دەژمێردرێت. چونکە لە میانەیەوە مرۆڤ دەتوانێت ئاڵۆزترین کێشە تاوتوێ بکات و دەرگای زۆر بابەتی هەستیار بکاتەوەو بێ ئەوەی ئازاری بەرامبەرەکانی بدات یان خراپ بێت لەگەڵیاندا.

دەربڕینی جوان و پاك ئەدەبێکی ئیسلامیەو چەندین دەقی پیرۆز جەختی لەسەر دەکاتەوە، ئەوەتا سەرورمان فەرموویەتی: (لایقولن احدکم: عبدي وامتي، کلکم عبیدالله، وکل نسائکم اماءالله ولکن لیقل: غلامي وجاریتي، وفتاي وفتاتي) رواه مسلم.





شەماڵ موفتی

# کواڵیتی ژیانی کار

## Q W L/Quality of Work Life

لە بابەتەکانی پێشووی (کواڵیتی ژیان)دا، تیشکمان خستە سەر کواڵیتی (تاك، گەلان، وڵاتان، شارەکان). لەبابەتی ئەم جارەماندا رونکردنەوەیەك دەخەینە خزمەتتان لە بواری کواڵیتی (ژیانی کار) بە هیوای جێی نرخاندنتان بێت.

بۆ یەکەمجار، زاراوەی (کواڵیتی ژیانی کار) لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا لە هیندستان سەری هەڵدا لەکاتی خرۆشی و نائارامی هێزی کاردا.

هەرچەندە تەنها لە ئاینی ئیسلامدا ئەم چەمکە بەدی دەکرێ - چ لە رووی مافی کرێکار و چ لە رووی خاوەن کار و سەنعەتکارەوە - بەڵام کەسانی تر بوون بە خاوەنی بە هۆی کەمتەرخەمیمانەوە. (کواڵیتی ژیانی کار) چەمکێکی گرنگە، هەڵبەتە جۆرە ناهەقییەك بووە هۆی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە.

شۆڕشی پیشەسازی، لەبەر پشت بەستنی - لە لایەکەوە - بە (تەکنۆلۆجیا) و سەرنجدان بە بەرهەمهێنانی گەورە و لە لایەکی دیکەوە یاریکردن بە توانای کرێکاران، هۆکاری سەرەکی بوون بۆ فەرامۆشکردنی خودی کرێکار و کارمەند. بۆیە دیاردەی خۆدزینەوە لە کار بە بیانوی نەخۆشییەوە یان بێزاربوون یان ئاشوبە نانەوە لە شوێنی کارکردن یان پابەند نەبوون بە رێنماییەکانی ئیدارەی کار... دیاردەی زەق و ئاشکرابوون.

کواڵیتی ژیانی کار چەمکێکی فراوانە، بریتییە لە بایەخدان بە ژینگەی کارو کەمکردنەوەی رۆتین، تا رادەیەك نزیك بێتەوە لە ئاستی خۆشی و ئارامی جێی نیشتەبوونی کارمەند. (واتە گەیشتن بە پلەی رازیبوون)، لەوەشدا راناوەستێت،بەڵکو بایەخ دەدا بە دەرەوەی شوێنی کارکردنیش.

یاخود بریتییە لە (کواڵیتی- جۆر) ی پەیوەندی نێوان کارمەندان و ئەو ژینگەیەی کاری تێدا دەکەن. بە شێوەیەکی تر: کاردانەوەی ئیدارەی ئەو (رێکخراو- دەزگا- کارگە- زانکۆ...) یە لەگەڵ پێداویستی و داخوازی کارمەندەکانیدا.

ئامانجی چاککردنی کواڵیتی شوێنی کار- جگە لە مافی کەرامەت و رێزلێنان - لە پێناوی گۆڕینی هەڵوێست و میزاج

و زیاکردنی بەرهەم و بەرزکردنی ئاستی ژیانی کارمەندان دایە، دەتوانین بڵێین: پرۆسەی بەمرۆڤکردنی کارە.

## پێناسەی (کواڵیتی ژیانی کار)

بریتییە لە هەر هەوڵێك لە پێناوی چاککردنی (بارودۆخ، سەلامەتی، ئاسایش و بەردەوامبوونی کار، موچە، سوود و بەرژەوەندی، فێرکردن و گەشەپێدان)ی کارمەندان.

واتە کارکردن تەنها نەبێتە قورساییەك و ئەرکێکی رووت، بەڵکو ژینگەی کار بە شێوەیەك بێت رێگە بە توانا و بیرۆکەی کارمەندان بدات دەرکەون و جێی نرخاندن بن.

ئەگەر کواڵیتی ژیانی کار لە شێوەی هاوکێشەیەك دەرببڕین، هاوکێشەکە بەم شێوەیە لای خوارە وە دەبێ:

ك ژ ك = کۆی بارودۆخ و رەنجە فیزیکییەکان + هۆکارە دەروونییەکان + هۆکارە ئابورییەکان.

نارازیبوون لە شێوازی کارکردن بەڵگە بوو بۆ سەرهەڵدانی (نادروستییەك/ کەموکورتیەك) لە ژینگەی کاردا و ئەمە پاڵینا بە کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهان لە پێناوی نەهێشتنی ئەو دیاردانە و زیاکردنی قازانجیان هەڵسن بە دارشتن و جێبەجێکردنی ستراتیجییەتێك کە سەرکەوتنی بەردەوام ببەخشێ بە پرۆسەی بەرهەم هێنانیان و رەچاوی خودی کرێکار و کارمەندان بکات بەم خاڵانەی لای خوارەوە:

١) زاڵبوونی دیموکراسی لە بەرێوەبردندا (جگە لە چەند بوارێك، تیمەکانی کار خاوەن بریار بن)

٢) ئیدارەی بەکۆمەڵ، واتە بەشداربون لە ئاستی "تیم و تاك" دا و رێزگرتن لە بیرۆکەکانیان.

٣) پەیوەندی تەندروست لە نێوان سەرپەرشتیار"بەرێوەبەر" و کارمەندان.

٤) رێزلێگرتنی کارمەند. " کەرامەت و مافەکانی، کارەکەی، مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەك مرۆڤ نەوەك بەکرێگرتە، شوێنگەی کار تەندروست بێت چ بۆ مێشك و دەرونیان و چ بۆ لەشیان، دەستە بەرکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی شیاو.. "

٥) رازیکردن و رازیبونی کارمەند. لە بوارەکانی: (ماوەی کارکردن، بیرۆکە و توانا و رەنج و داواکارییەکانی، مافی کارکردن بۆ ماوەی کورت، مافی وەرگرتنی کرێی زیادە بۆ ماوەی ئیشی زیادە، خەڵاتکرنی، سوپاس و پێزانین، بە ئەندامکردنی، بیمەی کۆمەڵایەتی و مافی خانەنشین و زیاکردنی موچە لەگەڵ زیادکردنی بەرهەم، بەدەمەوە چونی...)

توێژینەوەکان دەری دەخات کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ هەیە لە نێوان کواڵیتی شوێنی کار و بەرهەمهێناندا.

هەروەها رۆژگار دەریخست کە بایەخ نەدان بە کواڵیتی شوێنی کار وەك پێویست هۆکاری کەمبونەوەی دیققەت و وردەکاری کرێکارانە و پاشان دابەزینی برو کواڵیتی بەرهەمەکانە، جگە لە تێکدانی ئارامییان و ئاسان توڕەبوونیان و سکاڵا و دەربڕینی نارەزایی لە پیشەکانیان و هەموو ئەو جۆرە دیاردانە لە دەرئەنجامی کواڵیتی نزمی ژینگەی کارەوە روو دەدا.

چاککردنی جۆری ژیان لە شوێنی کاردا سپێردراوە بە (بەشی دەرامەتە مرووییەکان)، کە پێویستە لە هەموو دەزگایەکدا بوونی هەبیت. ئاخۆ پرۆسەی کارکردن - لە کەرتی گشتی و تایبەتدا- لە وڵاتمانا لە چ ئاستێکدایە؟

دەتوانین بڵێین کە ئەم وڵاتانەی لای خوارەوە بە عەمەلی پەیرەوی ئەو ستراتیجییەتە ئەکەن.

(سوید، دێنمارك، سویسرا، فەرەنسا، هۆڵەندا، ئۆستراليا، ئەمەریکا) و هەروەها زۆرینەی کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهانیش.

ئایا بیرکراوەتەوە لەچاککردنی کواڵیتی ژیانی کار و هەنگاوی پێویستی بۆ نراوە؟ یان چاوەرێی راپەرینێکی کرێکارین تا ئەوکات بیر بکەینەوە لە چاکسازی و گۆڕانکاری؟

**سەرچاوەکان:**

http://www.slideshare.net/neo013/quality-of-work-life-9462685

http://www.scribd.com/doc/48339041/Quality-Work-Life-Ppt

**ئەگەر کواڵیتی ژیانی کار لە شێوەی هاوکێشەیەك دەرببڕین، هاوکێشەکە بەم شێوەیە لای خوارە وە دەبێ: ك ژ ك = کۆی بارودۆخ و رەنجە فیزیکییەکان + هۆکارە دەروونییەکان + هۆکارە ئابورییەکان.**

**ئایا بیرکراوەتەوە لەچاککردنی کواڵیتی ژیانی کار و هەنگاوی پێویستی بۆ نراوە؟ یان چاوەرێی راپەرینێکی کرێکارین تا ئەوکات بیر بکەینەوە لە چاکسازی و گۆڕانکاری؟**



# شاگردی مەحوی‌و سەر مەشقیی موسا

بەپیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم
پەری بوو، ئەو نەبو، شەو بوو، بەسەر چووم
گلەی پێ شم لەسەر سەر هەم بوە بار
کە دیی من دولبەرم هات و بەسەر چووم

## مانای گشتی:

ڕێبوارێکی عەودالْ، پاش عەیامێك گەڕان و هەورازو نشێو برین، لەنیوە شەوێکی چاوەڕوانیدا دەرکەوتنی ڕوناکیەك ڕای دەچڵەکێنێت، کە ئەو بەڕوناکی ڕووی یاری دەزانێت بۆیە خێراو لەخۆشیدا بەسەر سەر بەپیریەوە دەچێت، بەڵام کە نزیك دەبێتەوە دەبینێت ڕوناکیەکە پەری بوو نەك یار، کە ئەویش لەبێگەردی و بێگوناهیدا وەك یار بوە، بۆیە ئەم لێی تێکچوو بەهەڵە ڕۆیشتبوو بەپیریەوە.

لەوەش ناخۆشتر قاچەکانی (مەحوی) کەزانیان بەسەر سەر بەپیری یارەوە چوە، سەرزەنشتیان کردووە، کە چۆن ئەو شەرەف و شکۆی ڕۆشتنەی بە (سەر) بەخشیوەو بەقاچەکانی نەبەخشیوە.

ڕاستی ئەو دوو بەیتە هێندە ناسك و ئاڵۆزن، هەردەڵێی ئەو لاسك و گوڵە لێك ئاڵاوانەیە، کە بەدەست لێدانیان دەژاکێن بۆیە ناچارین تەنها لەنزیکیەوە لێیان وردبینەوەو هەندێ لە نهێنیەکانیان تێ بگەین:

بەپیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم

مەحوی لەم نیوە بەیتەدا ڕوی یارەکەی لە خاوێنی لەهەڵو جوانی لەچاکە کردندا نەچواندوە بە مانگ بەڵکو دەڵێت ئەو خودی مانگە، شارەزایانی ڕەوانبێژیش ئەوە دەزانن لابردنی ئامرازی چواندن وێنەکە نزیکترو چواندنەکە بەهێزتر دەکات.

هەر لەم بەیتەدا عیشقەکەی مەحوی دەردەکەوێت حەقیقیە نەك مەجازی، چونکە (بەسەر چون)و (پەری) هیچیان بەرجەستە نین.

ڕێبوارێك بەڕێگای موسادا

لەم بەیتەدا ئاماژەیەکی نهێنی وەستاکارانەی شاعیر دەبینین بۆ بە سەرهاتی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) کاتێك لەنیوەشەودا لەپەنای کێوی (طور) ڕوناکیەکی بینی وتی بەخێزانەکەی لێرە بن تا دەچم لەو ئاگرە دەهێنم، بەڵام کاتێك ڕۆشت

دەبینێت ئاگر نیەو نوری ئیلاهیە، با سەرنجی ئایەتە قورئانیەکە بدەین کە دەفەرموێت (اذقال موسي لاهله اني انست ناراسئاتیکم منهابخبر او اتیکم بشهاب قبس لعلکم تصطلون) النمل ٦، ئەوجا دوبارە با شیعرەکە بخوێنینەوە:

بەپیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم

پەری بوو، ئەو نەبو، شەو بوو، بەسەر چووم

وەك دەزانین موسا دوای پەشیمانی لە پیاو کوشتنەکەی لە میصر ئیدی بەگەڕان لەدوی حەقیقەت عەوداڵ بوو، ساڵانێك هەرچی زەحرە کێشای تا ئەو شەوە بە خۆشەویستەکەی گەیشت بەڵام ئەوەی بینی تەنها نورێك بوو نەك زاتی پەروەردگار.

(مەحوی)ش دەیەوێت مەشقی ئەو ڕێبازە بکات بۆیە بەئومێدی دیدار درەنگانێك ڕوناکیەك دەبینێت بەیاری دەزانێت بەڵام ڕاستیەکەی تەنها پەری بوو کە ئاماژەیە بە ڕوناکی ئەو ناوەی ڕۆشن کردبووەوە، نەك خودی یار، بۆیە ئەمیش هەمان باسی موسای بەسەر هاتوە، چەند ئاماژەیەکی وردو ناسکە!

وردبونەوەیەك لەمانای وشەو ڕەسمی پیتەکان:

کارێکم بەوە نیە خوێنەر لێم دەسەلمێنێت یان نا؟

وەلێ کە سەرنج دەدەم لەمانای دەستەواژەی (ماه) کە ڕوی دۆستەکەی مەحویەو (چوم) کە حاڵی مەحوی خۆیەتی ئەم دوو دەستەواژەیە بەراورد دەکەم لەگەڵ مانای ڕەسمی پیتەکانیان لەسەر زمانی شاعیرانی کلاسیك (کە هەرپیتێکی ئەبجەدی لای ئەوان مانایەکی هەیە) تەواو ئەم پیت و وشانە کاڵای باڵان بۆ یەکتر.

### چۆن؟

**(ماه) دیارە نیشانەی جوانی و بێگەردیە، لای شاعیرانی کلاسیکیش (مـ) بۆ دەمێکە بچوکی جوان و پیتی (ا) بۆ بەژنو باڵایەکی ڕێکو بەرزو (ە) بۆ ڕومەتێکی خرو پڕ بەکاردەهێنن، جا سەرنجدە مانای هەرسێ پیتەکە (مـ، ا، ە) چەندە جوان هاتۆتەوە لەگەڵ مانای دەستەواژەی (ماه).**

**(چوم) یەکێك لەماناکانی لەم شیعرەدا بەمانای کەنەفتەو پەککەوتنو تیاچونە، سەیرە پیتی (چ)و (و) شاعیرانی کلاسیك بە پشتی چەماوەو لارو خواریان دەچوێنن، (م) بۆ دارعاساو گۆچانی دەستی پیران بەکارهاتون، کە مانای ئەم سێ پیتەش (چ، و، م) لەگەڵ مانای دەستەواژەی چوم تەواو یەکدەگرنەوە.**

تۆ بڵێی یەکانگیریی مانای وێنەی پیتەکانی (م، ا، ە) (چ، و، م) لەگەڵ مانای هەردوو دەستەواژەی (ماه) و (چوم) هەروەها ڕێکەوت بێت یان زیادە هونەرمەندی شاعیر ئەو سیحرەی خولقاندوە؟

### خۆ شکاندنو ستایش

سەرنجێکی وردتری دەستەواژەی (بەسەرچوم) بدەین دەبینین لەلایەکەوە بەمانای سکاڵای بەسەرچوونو پەککەوتنی شاعیر دێت تیایدا زەمی خۆی دەکات، بەڵام لەلایەکی دیکەوە ستایشی خۆی دەکات چونکە ئەو بەسەر چون و شەکەتیەی لەڕێی (ماه)ەکەی دا بوە وازی لێنەهێناوە.

دیارم دەیری عیشقە، جێ بەسوتن

بێ لەوێ دەگرم

کە من مشتێ چڵو چێوم، بەچی بم

کەڵکی کێ دەگرم

### تێبینی:

من بەیتی سێهەمی شعرەکەم لەگەڵ بەیتی دووهەم جێ گۆڕکێ پێ کردوە چونکە تەواوکاری مانای بەیتی یەکەمە، وای بۆدەچم لەکاتی ڕێکخستنی شعرەکانیدا ئەو جێ گۆڕکێیە بەهەڵە ڕویدابێت.

# کاتێك کە منداڵبووم!

و: مەهدی محەمەد

کاتێك کەمنداڵبووم دەمویست هەموو جیهان بگۆڕم.

کە گەورە بووم وتم: جیهان گەورەو فراوانە، با وڵاتەکەم بگۆڕم

لە هەرزەکاریدا وتم: وڵات زۆر گەورەیە، وا چاکە گۆڕانکاری لەشارەکەمدا بکەم.

شاریش زۆر گەورەیە کەوایە با کۆڵانەکەی خۆمان بگۆڕم.

کەتەمەنم بەرەو هەڵکشان چووتم: نا لە خانەوادەکەمەوە دەست پێدەکەم.

لە پایزی تەمەنمدا تەماشادەکەم دەبوو سەرەتا لەخۆمەوە دەستم پێبکردایە.

ئەگەر گۆڕانکاریم لەخۆمەوە دەست پێبکردایە خێزانەکەم، گەڕەگەکەم، جیهانیشم بەپێی توانام دەگۆڕی.



# تا حكومەت لەخەوی قووڵدا بێت دەستپاكی ناچەسپێت و گەندەڵی بنەبڕناكرێت!



د. ئەحمەد وەرتی

هەرچەنــدە دوور بیــت یــان بــێ لایەن بیت لە سیاســەت و ڕووداوەكان و دەرهاوێشــتەكانیان لە وڵاتــدا، ناتوانیت تووشــی سەرسامی نەبیــت و كاریگەر ودڵتەنــگ نەبیــت لــەوەی ڕوودەدات لەئاڵوگــۆڕی ڕووداوەكان و لێــدوان و هەڵســوكەوت و هەڵوێســتە جۆراوجۆرو دژبەیەكــەكان و گفــت و بەڵێنــی سیاسیەكان.

لەلایەكــەوە زیــاد لە دە ســاڵە باس لــە پابەندبوون دەكرێت بەدەســتووری عێراقــی و هەریەكــە و ئــەوەی تر بە پێشــێلكردنی تۆمەتبــار دەكات و خۆی لێ بەدەردەكات، دەســاڵە موژدە دەدرێت دەســتبەكاربوون بــۆ دروســتكردنی عێراقی نوێ و بەرقەراركردنی ئاســایش و ئۆقرەیــی بــۆ خەڵكــی عێــراق و حكومەتــداری بە عەدالــەت و دوور لە تایەفەگــەری و قەڵاچۆكردنی گەندەڵی، بەڵام شــتێكی ئەوتــۆ لەســەر زەمینی واقیــع نابینرێــت جێی دڵخۆشــی بێت، ئەگەر نەڵێین پێچەوانەی هەموو ئەوانە راستە لەوڵاتێكی خوا پێ داودا كە لەسەر دەریای نەوت و سامانی سروشتی دایە.

لەهەرێمی كوردســتانیش ســاڵەهایە قســە لەســەر چاكســازی و چەسپاندنی ســەروەری یاســا و بەرەنگاربوونــەوەی گەندەڵی دەكرێت، ڕۆژانە گوێی هاوڵاتیان كاس بــووە بــە ڕاگەیانــدن و لێدوانــی هەردوو بەرەی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن و هەمووولایەنەكان و بەڵێن و دروشــمەكان بۆ باشــكردنی ژیــان و گوزەرانی خەڵك و نەهێشــتنی ڕۆتیــن و گەندەڵــی و پیادەكردنــی حكومەتــی هاوڵاتیبوون و شەفافیەت و دادپەروەری!

ئێستاش بەدەستبەكاربوونی دەستەی نەزاهە و ســوێند خواردنی سەرۆكەكەی لەپەرلەمانــی كوردســتان، ئایا تا چەند گەندەڵــی بنەبڕدەكرێــت و نەزاهەت و دەســپاكی جێی دەگرێتەوە لــە كاتێكدا عێــراق و هەرێمــی كوردســتان بەپێی ڕاپۆرتــە نێودەوڵەتیــەكان و لێكدانەوە ناوخۆییەكانیــش لەپێشــەوەی وڵاتــە گەندەڵ و ناشەفەكاندایە ؟!

ئێســتا كەمینەیەكی گەندەڵ حوكمی وڵات دەكات و زۆرینــەش ناچار دەكرێت بــە بێدەنگ بــوون گەرنــا ڕووبەڕووی ســزادان و بێبەشــكردن لەمافەكانیــان دەبنــەوە، ئەوەتــا ماوەیــەك لەمەوبەر (باتریــك كۆبــرون) لەڕۆژنامــەی ئیندپیندنــت-ی بەریتانــی راپۆرتێكی گرنگــی لەبــارەی عێراق بڵاوكــردەوەو باســی لە دیاردەی گەندەڵــی كردبوو و لەســەر زمانی یەكێــك لەپیاوانی كاری ئەمریكی گواســتبۆوە كە مامەڵە دەكات لەگەڵ یەكێك لــە وەزارەتەكانی عێراق و جەختــی لەوە كردبۆوە كە لە ســەدا ١٠ی ئەوانەی كاری تێدا دەكەن گەندەڵن و بەرتیــل وەردەگــرن، ئەوانــی تر كە لەســەدا ٩٠ە ئاگادارن كە چۆن وچەندە ســامانی وڵات لەلایەن ئەو ڕێژەوە( ئەو چەند كەسەوە) بەهەدەر دەدرێت، بەڵام بێ دەنگــی و وەرگرتنــی مووچەكانیان هەڵدەبژێــرن چونكــە بــاش دەزانــن قســەكردن لەدیاردەكە و پەردەهەڵماڵین لەســەر گەندەڵكاران بەهیلاكیان دەبات و نانبڕاویــان دەكات، ئەمە بەنیســبەت هەرێمی كوردستانیش ڕاستە و گەندەڵی و ڕۆتین و بەرتیــل و بەرتیلكاری بۆتە مۆتەكەی هەرێم..

لەو بارەوە چیرۆكێك دەگێڕدرێتەوە كە منداڵێك پرســیار لــە باوكی دەكات

لەبارەی مانای (گەندەڵی سیاسی)، باوکیشی بۆ ئەوەی بە باشی تێیبگەیەنێت و گەندەڵی سیاسی بۆ ڕاڤە بکات لەڕێگەی ڕێکخستنی خێزانەکەیانەوە نموونەی بۆ دێنێتەوە و خۆی وەك سەرۆکی خێزان و بە سەرمایە و سەری ئەو سامانە ڕێکخراوە بۆ خێزانەکە دەداتە قەڵەم و دایکی منداڵەکە بەحکومەت حسێب دەکات و منداڵەکە و خوشکە بچووکەکەشی بەگەل و کچە خزمەتکارەکەی ماڵەوەشیان بەهێزی کارو زەحمەتکێش دادەنێت، ئینجا بەکوڕەکەی دەڵێت لەمیانی دەرکەوتنی کەم و کورپیەك لەڕێکخستنی ئەم سیستەمەدا گەندەڵی سیاسی بەدەردەکەوێت.. کاتێ شەوهات ،منداڵەکە گوێی لەدەنگی گریانی خوشکە بچووکەکەی بوو بۆیە ڕۆیشت بۆ لای دایکی بۆ ئەوەی بزانێت بۆچی بێدەنگی ناکات و ژیری ناکاتەوە، سەیری دایکەکەی کرد لەخەوێکی قووڵدایە، ئینجا گەڕا بەدوای باوکی دا و لەکونی دەرگاوە بینی لە ژووری خزمەتکارەکەیە !

بەیانی کوڕەکە بەباوکی وت : من تەفسیرێکی باشتر و ڕوونترم هەیە لە تەفسیر و ڕاڤەی تۆ بۆ گەندەڵی سیاسی، باوکەکە وتی چۆن ؟ منداڵەکە وتی : کاتێك سەرمایەداریی یاری بەهێزی کارو زەحمەتکێش دەکات و حکومەتیش لەخەوێکی قووڵ دابێت، ئەوا گەل لەسەر گەردانی و پەراوێزخستن و بێهوودەییدا دەبێت و ئایندەشی نوقم دەبێت لەنەگریسی .. !!!

بۆیە تازووە دەبێ دڵسۆزانە بەرپرسانی وڵات خەمی ئاینده بخۆن و چەسپاندنی دەسپاکی و عەدالەت و بەرەنگار بوونەوەی گەندەڵی لەچوارچێوەی بەڵێن و دروشم دەربچێت، دیارە بەردەوامبوونی ئەم حاڵەتە و بێ دەنگبوونی حکومەت و جددی نەبوونی سەردەکێشی بۆ ئەوەی کۆمەڵگا ببێتە دیلی چەند کەسێکی گەندەڵ و لەخوانەترسی مشەخۆر و ئایندەی وڵاتیش پەلکێکشی چارەنووسێکی نادیار دەکات.

# خواردن

د/هەڵگورد فتح الله احمد دکتۆراە لە پزیشکی هەناو ودڵ



مرۆڤ پێویستی بە خواردن هەیە، بەڵام بەجۆرێك خواردن بخوات تابژیێت، نەوەکو وەك ئەمرۆ پێچەوانە بۆتەوە، بۆئەوە بژین تاوەکو بخۆین، بەداخەوە ئەم سیناریۆیە گۆڕاوە، وای لێهاتووە، خەڵکی ئیشی نیە تەنها خواردن نەبێ،چەندکاژمێر لە خواردنگەکان دادەنیشن و هونەری خواردن وخواردنەوە ئاڵوگۆڕدەکەن، ژیانیش ئەمڕۆ وای لێهاتووە،هەمووی دانیشتنە، بەهۆی ئۆتۆمبێل و کۆنترۆڵی تەلەفزیۆن وئامێرە کارەباییەکان، هەر دادەنیشین وجووڵە کەمبۆتەوە، سەرەنجام قەڵەوی وماکەکانی کەدەیان نەخۆشین دەبنە میوانمان ،چ لە شەکرە وفشاری خوێن، نۆرەی دڵ و مێشك ... تا دەگاتە شێرپەنجە. بۆیە زۆر گرینگە ڕۆژانە چەند دەخۆیت ،ئەوەندە بەکاربەیت،چونکە گەر زۆرترت خوارد ئەوا لەلەشدا کەڵەکە دەبێت.

جۆری خواردنیش زۆرگرینگە ،سەوزەو میوە تادەکرێت زۆرتر بخورێت، لەبەرامبەردا چەوری،خوێ،خۆراکی قوتووبەند کەمبکرێتەوە، ئەمەش بەکابانی ماڵ دەکرێت، ئەو بەپلەی یەکەم بەرپرسە لەو خواردنەی ئامادەی دەکات، تاوەکوبکرێت کەرەسەی سروشتی خاو بەکاربێنێ، بۆ ئەوەی ژیانێکی سروشتی دوور لە نەخۆشی بۆ ئەندامەکانی خێزانەکەی دەستەبەربکات.

نووسینی: م. ئاسۆس ئەنوەر سلێمان



# چۆن پەیوەندیەکی کارا دروست دەکەین؟

زمان یەکێکە لەو ئامرازانەی پەیوەندیکردن کە چۆنییەتی بەکارهێنانی دەکەوێتە ئەستۆی خاوەنەکەی، دەکرێ بیکاتە مایەی ئاشتەوایی و رێز و خۆشەویستی و پتەوکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، یاخود بەپێچەوانەوە بیکاتە سەرچاوەی دوبەرەکی و ئازارو رك و تێکدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، وەك چۆن چەقۆ ئامرازێکە، دایك خواردنی پێ ئامادە دەکات بۆ منداڵەکانی، کەچی بەدەست مرۆڤی خراپەوە بۆ ئازار و تاڵانکردن بەکاردەهێنرێت. کەواتە بۆ دوو کاری پێچەوانەی یەکتر بەکاردەهێنرێن، بۆیە پێویستە بەر لەوەی قسە بکەین، ئەمانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین:

بۆ قسە دەکەین؟

لە کوێ قسە دەکەین؟

لەگەڵ کێ قسە دەکەین؟

کەی قسە دەکەین؟

**یەکەم: بۆ قسە دەکەین؟**

ئێمە رۆژانە بۆ رایی کردنی کارەکانی خۆمان و دەرچوونمان لە بازنەی تاك، پێویستمان بە دەوروبەر دەبێت و لەرێگەی زمانەوە ئەم پەیوەندییە دروست دەکەین، ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، کاتێك قسە دەکەین بیر لە ئامانجی قسەکردنەکەمان بکەینەوە تەنانەت ئەگەر بۆ کات بەسەربردن و پێکەنینیش بێت، چونکە ئەویش ئامانجێکە و پێویستیەکی مرۆڤە و مافێکی تاکەکەسییە لە کۆمەڵگەدا، بۆیە با لەخۆمانەوە قسە نەکەین، پێشتر ئاکامی وتنی ئەو وشەو رستانە لەبەرچاوبگرین کە دەیڵێین، تاوەکو بزانین قسەکردنەکەمان پێویستە یاخود نا.

**دووەم: لەکوێ قسە دەکەین؟**

مرۆڤ لەکاتی قسەکردندا دەبێ

ژینگـەی قسـەکردن لەبەرچاوبگرێت و بزانێ لەکوێ قسەدەکات، چونکە جۆر و شـێوازی قسـەکردنمان دەبێ بگونجێت لەگـەڵ ئەو شـوێنەی کە قسـەی تێدا دەکەین، بۆ نمونە: ئەگەر تۆ لە پرسەی کەسـێکدا نوکتە بۆ خەڵـك بگێریتەوە، دەبێ بزانی کارێکی نابەجێت ئەنجامداوە، چونکـە گێرانەوەی نوکتەو بەسـەرهات کە پێکەنین دروسـت دەکەن ناگونجێت لەگـەڵ ئەم شـوێنە، تەنانەت شـێوازی قسەکردن و بەرزو نزمی دەنگمان دەبێت بگۆڕین، بۆ نموونە: ئەگەر لە گەشتێکدا لە گـەڵ هاوڕێکانت بیت بـە ئارەزووی خـۆت دەنگ بـەرز دەکەیتـەوە، بەڵام شـیاو نییە بۆت ئەگەر لەشوێنێکی وەك نەخۆشخانە یان کتێبخانەو قوتابخانەدا بەمجۆرە قسەبکەیت.

### سێیەم: لەگەڵ کێ قسە دەکەین؟

دوای ئەوەی بڕیارماندا قسـە بکەین، دەبـێ بزانین لەگەڵ کێ قسـە دەکەین، چونکە قسـەکردنمان لەگەڵ کەسایەتی جیاوازدا بەیەك شێوە نابێت، بۆیە دەبێ ڕەچاوی بەرامبەر بکرێت، بەشـێوەیەك هەریـەك لـە تەمـەن و پلـەو پایـەی کۆمەڵایەتی و زانستی و ڕەگەز و.....هتد دەبـێ بکرێن بە پێوەر بـۆ هەڵبژاردنی وشـەو ڕسـتەکانمان تەنانەت شـێوازی دەنـگ و ڕادەی بەرز و نزمی و سـەدای قسـەکرنمان، بەنموونـە، کاتێك قوتابی لەگەڵ مامۆسـتایەکی خۆی قسـەدەکات دەبـێ ئەوپـەڕی ڕێز بنوێنێـت نابێت بەمشـێوەیە قسـە بـکات وەك چۆن بۆ هاوڕێیەکی نزیکی خۆی دەدوێت.

### چوارەم: کەی قسە دەکەین؟

دەوترێـت گوێگرتـن زانسـتێکی قورسـترە لە قسـەکردن ،هەندێك جار باشـترین وەڵامە بۆ هەندێك پرسـیار، بۆیـە جوانتریـن شـتە کاتێـك پابەند دەبیـن بە گوێگرتـن لـەو کاتانەی کە پێویستە، بۆیە لە قسەکردندا وەك چۆن مـاف بەخۆمان دەدەین، دەبێ بۆ هەمان مەبەسـت پێشـێلی مافی بەرامبەریش نەکەیـن، تەنانەت دروسـت وایە زیاتر گرنگـی بـە گوێگرتن بدەین، قسـە بە بەرامبەر نەبڕین.

**خودای گـەورە دوو گـوێ و یەك دەمی پێ بەخشـیوین، هەربۆیەش لە هونەری قسـەکردندا وا پەسەندە لە کاتی پەیوەنیکردندا گوێگرتنمان دوو ئەوەندەی قسەکردن بێت.**

**هـەر لەبـەر ئەمـەش دوترێت: ((گوێگری باش کەسـێکی کارامەیە لە پەیوەندیکردنـدا)) بۆیـە گوێگرتنی باش بـە یەکێك لە خاسـیەتە هەرە گرنگەکانـی کارامەیی پەیوەندیکردن دادەنرێـت، کەواتە بۆیـە دەبێ فێری ئەوە ببین کەی قسە بکەین.**

لـە ئەنجامدا دەڵێیـن: بەکارهێنانی زمان لە دەسـتی ئێمەدایە، بەڵام کارێکی ئاسـان نییـەو دەبـێ فێـری هونـەری بەکارهێنانـی ببیـن، تاوەکو لە بایەخی ئەو بەخششـە گەورەی خـودا کە زمانە کەم نەکەینەوە و بەشـێوەیەکی گونجاو لەگـەڵ دەرووبەرمان بـەکاری بهێنین و جوانتریـن و بەنرخترین پەیامی پێ ئاڵوگۆڕ بکەین.

# چەند دێڕێك

## لە مەڕ هونەری سەركردایەتی كردن

نومێد موستەفا

**ئامانج لەم بابەتە:**

• هەندێك بۆچوونیان وایە كە سەركردەكان سەركردەن هەر لەو كاتەی كە لەدایك دەبن، بەڵام توێژینەوەكان سەلماندوویانە كە ئەم بۆچوونە هەڵەیە چونكە زۆرێك لە سەركردەكان كە بوون بەسەركردەی مەزن و گەورە، پێشتر دوورەپەرێز و نەناسراوو كەسانی سادەو ساكار بوونە.

• سەركردایەتی كردن بایەخ و گرنگییەكی زۆری هەیە لەسەرجەم بوارەكانی ژیاندا، هەروەها هونەرێكە دەتوانین فێری بین چونكە خەسلەتەكانی سەركردایەتی كردن دەكرێ لە كایەكانی خویندن و فێربوون بخوێندرێت.

• ئەم بابەتە یارمەتیدەرو سوودبەخشە بەشێوەیەكی كاریگەر بۆ فێربوونی كارامەیی و هونەرەكانی سەركردایەتی كردن و رەگەزەكانی.

**هەندێك لەو خاڵانەی كە پێویستە بزانرێت بەر لە دەستپێكردنی سەركردایەتی كردن:**

١- لە توانای كەسێكدایە كە ببێتە جیاكەرەوەی نێوان سەركەوتن و شكستخواردن لە هەر دامەزراوەیەكدا، هەروەها لە هەمان كاتدا ئەم كەسە دەتوانیت ببێت بە سەركردە لە داهاتوودا.

٢- یەكێك لە راستییە سەرسوڕهێنەرەكان ئەوەیە كە ئاماژە بەوە دەدات زۆربەی خەڵكی ناتوانن بگەن بە سەركەوتن مەگەر لە میانەی یارمەتیدانی كەسانی ترەوەبێت، هەڵبەتە ئەم یارمەتیدانەش بەدەستدەهێنرێت لە رێی پیادەكردنی هونەری سەركردایەتی كردنەوە.

٣- ئەگەر فێری رەگەزە بنچینەییەكان بوویت لە نموونەی جەنگی سەركردایەتی كردن، ئەوا

ئـەوكات دەتوانیـت زۆر بەئاسـانی سـەرکردایەتی هەمـوو رووداو و ئەگـەرەکان بکەیـت، ئەمـەش لەبـەر ئەوەی جەنگەکە گەورەترین بەرهەڵستی کردنی سەرکردایەتی کردنە لە رووبەرو بوونەوەی مەترسی و توندوتیژی ژیان و گومان و دوودڵی و سزادان لەسەر شکست و پاداشت وەرگرتن لەسەر سەرکەوتن.

٤- گەوهەری سـەرکردایەتی کردن شتێکی سادە و ساکارە، ئەمەش بریتییە لە وروژاندنی خولیا و خۆزگەی تاکەکان بۆ بەگەڕخستنی ئەوپەڕی تواناکانیان لـە پێناو هاتنەدی ئـەو ئامانجانەی کە دیاری کراوە.

٥- سەرکردەکان دروسـت دەکرێن نەك لە دایـك دەبن، جا ئەگەر بتەوێت ببیت بە سـەرکردە ئەوا پێویستە فێری چۆنییەتی هەمان ئـەو رێگایە بیت کە کارامایییەکانی تری لێوە فێر بوویت.

## هەشت یاسا گشتییەکانی سەرکردایەتی کردن:

١- پابەندبوون ئەمانەتێکی رەهایە:
ئەمـە بنچینەی هەمـوو جۆرەکانی سەرکردایەتی کردنە،جا ئەگەر ئەمانەت پارێز نەبوویت زۆر ئەسـتەمە بتوانین متمانەی ئەو کەسـانە بەدەست بهێنیت کەوا سەرکردایەتییان دەکەیت.

٢- گەوهەری خۆت بناسە:
شـوێن کەوتـووان زۆر بەلایەنـەوە گرنـگ نییـە کە چەنـد لێهاتـووی لە سیاسـەتی بەرێوەبردنی نووسینگەکەت، بەڵکـو ئەو لێهاتوویی و بیلیەمەتییەیان لە تۆ دەوێت کە راپەڕاندن و تەواوکردنی کارەکان لێی دەخوازن.

٣- هیواو ئومێدەکانت رابگەیەنە:
ناتوانیـت بگەیـت بە (ئـەوێ) تاکو نەزانی ئەم (ئەوێ)یە چیە،پێویستیشـە شوێن کەوتووانت لەمە ئاگادار بکەیتەوە.

٤- پابەندبوونێکی نا ئاسایی دەربخە:
ئەگەر بۆخۆت پابەندنەبوویت، ئەوا هیچ کەسێکی تر پابەند نابێت، هەروەها ئەگـەر بەشـێوەیەکی نائاسـایی پابەند نەبیـت ئەوا بەهەمان شـێوە کەسـیش پابەند نابێت.

٥- پێشـبینی ئەنجامە پۆزەتیڤەکان بکە:
ئەگەر پێشبینی سەرکەوتنت نەکرد، یان پێشـبینی شکستت کرد، ئەوا تووشی کارەسـات بوویت،بۆیە -هەرچەندە خۆ ئامادەکردنـت بـۆ رووبەرووبوونـەوەی باردۆخـی خراپتـر شـتێکی ئاسـایی و مەعقولـە- پێویسـتە لەسـەرت کـە پێشبینی بارودۆخی باشتر بکەیت.

٦- بایەخ بە پیاوەکانت بدە:
ئەگەر گرنگی و بایەخت بە پیاوەکانت دا ئەوا بێگومان پیاوەکانیشـت بایەخت پێدەدەنـەوە، هەروەهـا پێچەوانـەی ئەمەش راستە.

٧- ئەرکـەکان بخـە پێـش بەرژەوەندیەکانت:
ئەگەر بڕیـارە سـەرکردەبیت، ئەوا دەبێ ئەرکـەکان و پیاوەکانـت بخەیتە پێش بەرژەوەندییە کەسییەکانت، ئەگەر نـا بە سـەرکردە دانانـدرێیـت وهەژمار ناکرێیت.

٨- لە پێشی پێشەوە بە:
ئەگـەر بـۆ زانیـن و بینینـی هەر رووداوێـك بـەر لـە هەمـووان بـۆی چوویتـەدەر و بەدواداچوونت بۆی کرد، ئـەوا نـەك هـەر دەزانیت چـی رووی داوە و بـارودۆخ چییـە، بەڵکو شـوێن کەوتووانیشـت دەرك بـە پابەندبوون و خەمخۆریت دەکەن.

## چوار لەو هەنگاوانەی کەوا لە خەڵکی دەکەن شوێنت بکەون:

١- وا لەخەڵکی بکە کە هەست بە بایەخ و گرنگی خۆیان بکەن:
خەڵکی ئـەوکات بەدوات ئەکەون کە هەست بە گرنگی خۆیان بکەن، نەك بە پێچەوانەوە هەست بە گرنگی تۆ بکەن.

٢- تێروانینەکەت بڵاوبکەوە:
کەس شـوێنت ناکەوێت تەنها لەبەر ئەوەی ئارەزووی سـەرکردایەتی کردنت هەیە، بەڵکو بێگومان دەبێ بیرۆکەیەکی رۆشـنت هەبێت سەبارەت بەو ئامانجەی کەدەتەوێـت کۆمەڵێـك پێیبگـەن، جا ئەوکات پێویسـتە ئەم بیرۆکەیە لە نێو تاکەکانـی کۆمەڵەکـەت بڵاوبکەیـەوەو قایلیان بکەیت بە بە بەرزی و گەورەیی ئامانجەکەت.

٣- مامەڵە لەگەڵ کەسـانی تر بکە وەکـو ئەوەی کە حـەزت لێیە مامەڵەت لەگەڵ بکەن:
ئەمـە شـتێکی زۆر سـەرەکی و بنچینەییـە جـا لەبەر چـی زۆربەمان نایکەین؟ بیهێنەوە یادت: ئایا ئارەزووی شـوێن کەوتنـی کەسـێك دەکەیـت کە مامەڵەی خراپت لەگەڵ بکات؟ ئایا شوێن کەوتنی ئەو سەرکردانە بەپێش ناخەیت کە مشووری کاروبارەکانت دەخۆن و لە هەستەکانت دەگەن و بە جوانی مامەڵەت لەگەڵ دەکەن؟ بێگومان ئەو کەسانەش هەروا دەکەن کە شوێنت دەکەون.

٤- بەرپرسـیارییەتی کارەکانـت و کاری کۆمەڵەکەت بخە ئەستۆی خۆت:
ددان بـە هەڵەکانـی خـۆت دابنێ،و ئـەوەش بزانـە کـە تـۆ بەرپرسـی لەبەرامبـەر هـەر کارێك کـە تاکەکانی کۆمەڵەکـەت دەیکـەن و ئـەوەی نایکەن،بۆیـە کاتێك هەڵەیەك روودەدات هەڵگرتنی بەرپرسیارییەتی ئەم هەڵەیە لە بیرمەکە، جـا ئەگەر هەوڵتدا نکوڵی لەم بەرپرسیاریەتییە بکەیت و بیخەیتە ئەسـتۆی کەسانی تر، ئەوا لەم حاڵەتەدا بە سەرکردە داناندرێیت.

# منداڵ و پشووی هاوین!!

نووسینی: ئارام نبی



منداڵەکانمان سامانی ڕاستەقینەی ئێمەن، نەوەی دوارۆژی ئەم وڵاتەن، ئایندەی ئەم میللەتە بەستراوەتەوە بەئایندەی ئەوان، پێشکەوتنی کۆمەڵگا وابەستەیە بە ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی ئەوان، گرنگیان بەدێرو دوو دێڕ نایەتە باسکردن، بەڵام ئەوەی بابەتی ئێمەیە ئەوەیە کەمنداڵەکانمان چۆن سوودمەندو بەهرەمەند دەبن لەپشووی هاوین؟!.

پشووی هاوین دەرفەتێکی زێڕینە بۆ منداڵە چاوگەشەکان، هەلێکی باشە بۆ بەرزکردنەوەی کارایی و ئاستی ڕۆشنبیریان، بۆیە ناکرێت هەروا بەئاسانی واز لەمنداڵەکانمان بهێنین بۆخۆیان چیان پێخۆشە ئەنجامی بدەن، چونکە ئەوان منداڵن نازانن کامە کار باش و بەسوودە بۆیان، نازانن ئەوەی ئەنجامی دەدەن سەرەنجام بەرەو کوێیان دەبات، بۆیە ئەوان پێویستیان بە ڕێنموونی و ئامۆژگاری کەسانی دڵسۆز و بەوەفا هەیە، پێویستیان بەکەسێك هەیە کات و کارەکانیان بۆ ڕێك بخات، هیچ کەسێکیش هێندەی دایك و باوك پەرۆش نیە بۆ منداڵەکەیان، بۆیە پێویستە هەر دایك و باوکێك هەڵسێت بەڕۆڵی سەرەکی خۆی، چونکە بەرپرسیارن لەسەرەنجامی منداڵەکانیان، پێویستە لەسەریان بەرچاو ڕوونی بکەن بۆ منداڵەکانیان، پێویستە بەرنامە و پلانی تایبەتیان هەبێت بۆ منداڵەکانیان، پێویستە ئەوان دەست نیشانی ئەو کارانە بکەن کە منداڵەکان پێی هەڵدەستن.

دایبابی ئازیز... لەم پەڕاوەدا بەکورتی چەند خاڵێکی گرنگ دەخەینەڕوو کە دەتوانیت بیانخەیتە نێو لیستی پلانی کارەکانتەوە، جێبەجێ کردن و ئەنجامدانی ئەم کارانە دەبن بە گەواهیدەر لەبەرامبەر خۆشەویستی بێ سنووری ئێوە بۆ جگەرگۆشەکانتان.

* داکبابی خۆشەویست... دەبێت منداڵەکانت بپارێزیت لەکاری هەڕەمەکی و بێسەروبەرو بێ سوود، بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە منداڵەکانمان لەپشووی هاویندا بەکارانێکەوە سەرقاڵن نەك هەر سوودیان پێناگەیەنێت، بەڵکو بەهۆیەوە زیانی زۆریان پێدەگات، وەکو (ئەتاری، تۆپێن، سەیرکردنی تەلەفزیۆن، کەلایانێ، ڕەسم ڕەسمانێ، پایسکلسواری، گەڕانو سوڕان لەناو کوچە و کۆڵانەکاندا،....تاد)، وابەستەبوون بەم کارانەوە منداڵ تووشی نەهامەتی و دەردیسەری دەکات، بۆیە تۆ وەکو داکبابێکی دڵسۆز دەبێت ڕێگری بکەیت لەوەی کە نەهێڵیت منداڵەکەت ئالوودەی ئەم کارانەبێت، سوپاس بۆ خوا لەئێستادا زۆرن ئەو سەنتەر و ناوەندانەی کەکار بۆ پێگەیاندن و ڕۆشنبیرکردنی منداڵان و لاوان دەکەن، بەکردنەوەی خولە فێرکارییە جۆربەجۆرەکان، ئێوەش دەتوانن منداڵەکانتان ڕەوانەی یەکێك لەم خولانە بکەن: (خولی قورئان، خولی زمان، خولی پەرەپێدانی کەسی، خولی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر، خولی وەرزش، ...تاد).

* داکبابی ئازیز... مرۆڤ بەردەوام دەگۆڕێت بۆ ئەوشتە کەڕاهێنانی بۆ دەکات، تۆش منداڵەکەت ڕابێنە لەسەر خوێندنەوە، ڕۆژانە خوێندنەوەی نیو کاژێر پەرتووك لەلایەن منداڵەکەتەوە کاریگەریەکی ئەفسووناوی جێدەهێڵێت لەسەر داهاتوویان، چونکە خوێندنەوە خۆراکی مێشکە، خوێندنەوە ئاوەزی مرۆڤ بەهێز و فراوان دەکات، خوێندنەوە ڕەوشتی بەرز و زمانی پاراو بەمنداڵەکانت دەبەخشێت. کتێب هۆکارێکی گرنگی پەروەردەییە، بەهۆی کتێبەوە منداڵەکەت کەسێکی تایبەتمەند و جیاوازی لێدەردەچێت.

بەڵام ئاگاداربە، دەبێت بزانیت چی دەخەیتە بەردەم منداڵەکەت بۆ خوێندنەوە، نابێت کتێبێکی سەد بۆ دووسەد لاپەڕەیی بدەیتە منداڵ بۆ خوێندنەوە، چونکە ئەم جۆرە کتێبانە بۆ ئەوان وەکو شتێکی بێزارکەر هەراسانکەر دێتە بەرچاو، خوێندنەوەی کتێبی گەورە بۆیان ئەستەمە، بۆیە کارێك مەکە منداڵەکەت ڕقی لەکتێب ببێتەوە، پێویستە لەسەرت ئەو نامیلکە و کتێبانە پێشکەشی منداڵەکەتی بکەیت کە جوان و ڕازاوە و ڕەنگاو ڕەنگ بێت، ئەو نامیلکانەی کەتایبەتن بەبابەتی منداڵان، بۆ دەستخستنی ئەم جۆرە نامیلکانە هیچ پاساوێك نیە چونکە بازاڕ پڕیەتی لە نامیلکە و کتێبی منداڵان.

* داکبابی بەڕێز... یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە گرنگی تایبەتی هەیە، یاریکردنە، نابێت بەشێوەیەکی وا منداڵەکەت بخەیتە ژێرفشارەوە کە دەرفەتی یاری و گەمەکردنی لێ زەوت بکەیت، ئەمە کارەسات دروست دەکات!!.

یاریکردن ڕۆڵی گرنگی هەیە لەپێگەیاندن و نەشونماکردنی منداڵ، نەك هەر ئەوەش بەڵکو ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لەگەشەی عەقڵ و جەستەی منداڵ، بۆیە هەرگیز نابێت منداڵان قەدەغەی یاری بکرێن، سروشتی ئەوان وادەخوازێت حەزیان بەیاریکردن و هەڵبەز و دابەزە، بەڵکو ئەگەر دەتوانیت و بۆت دەگونجێت ئەوا پێداویستی یاریکردنی بۆ بێنە ماڵەوە، لەگەڵا ئەمەشدا با چەند هاوڕێیەکی ماڵەوەی هەبن بۆ یاریکردن، چونکە بەتەنها یاریکردن تام چێژی ئەوتۆی نیە و زوو وەڕس بوونی لێدەکەوێتەوە، بەوهۆیەشەوە منداڵەکەت دەپارێزیت لەچوونە کۆڵان و سەرجادە!!.

* داکبابی دڵسۆز... یەکێك لەشاکارە دیارەکانی پشوو، گەشت کردن و چوونەدەرەوە و پیاسەکردنە، هەروەکو چۆن منداڵەکەت پێویستی بەوەرگرتنی زانیاری و خوێندنەوە و یاریکردن هەیە، بەهەمان شێوە پێویستی بەگەشت و گەڕان هەیە، هەوڵبدە گەشت کردن بخەیتە لیستی بەرنامەکەتەوە، گەشتێك بەمنداڵەکەت بکە بۆ شارێکی کوردستان کەنەیبینیبێت، یان گەشتێك بۆ سەیرانگایەکی دلگیر و خۆش، ئەگەر لەتواناشتدا هەیە ئەوا گەشتێکی دەرەوەی وڵات بەمنداڵەکەت بکە، ئەگەر هیچ یەکێك لەوانەی باسکران ناتوانیت ئەنجامی بدەی ئەوا منداڵەکەت ببە بۆ پارکێکی ناوشار کەمنداڵەکەت حەزی پێبکات، چونکە منداڵ پێویستی بەوە هەیە لەگەڵا خێزانەکەی بەکۆمەڵ بچن بۆ گەشت و سەیران، چونکە منداڵ چێژ لەهەریەك لەمانە وەردەگرێت و هەست بە بەختەوەری و ئاسوودەیی دەکات، هەروەها هۆکارێکیشە بۆ فراوانبوونی ئاوەز.

* دیاردەیەکی دزێو.... بەداخەوە دیاردەیەکی زۆر ناپەسەند و نەشیاو هەیە لەناو کۆمەڵگاکەمان کە باوك بەرامبەر منداڵەکەی دەکات ئەویش ئەوەیە هەرکە پشووی هاوین هات، منداڵی بەستەزمان دەبێت لەگەڵ باوکی مل بداتە ئیش، ئەمە ستەمە لەمنداڵ دەکرێت، تۆ بەو کارەتەوە حەز و ئارەزووەکانی منداڵەکەت زیندانی دەکەیت، دەرفەت و کاتی بەشداربوون لەخولەکان و یاری لێت زەوت دەکەیت، بەمەش منداڵەکەت ناتوانێت سوود لەپشووی هاوین وەربگرێت.

لەکۆتاییدا دەڵێم: منداڵەکەت خەریك بکە، ئەگینا بەخۆیەوە خەریکت دەکات، منداڵەکەت بەکارانێکی باش و بەسوود سەرقاڵ بکە، بەکارانێك کەدەرئەنجامەکەی لای خۆت ڕوون و ئاشکرابێت، تۆ بەرپرسی سەرەکیت لەفەراهەم هێنانی ژینگەیەکی لەبار بۆ پەروەردەی منداڵەکەت.



# لە عەقڵیەتی فەردیەوە بۆ دامەزراوەیی

عبدالحكيم زراری

بێگومان کاری دامەزراوەیی یان (کارکردن لە میانی دامەزراوەیەك) یان (کارکردن بە عەقڵییەتی دامەزراوەیی) فۆرمیکە لە فۆرمەکانی گوزارشتکردن لە: هاوکاری کردن لە نێوان خەڵك یان ئەوەی پێی دەڵێین کاری هەرەوەرزی (Collaborative Work)، هەروەها ئارەزوویێکە بۆ قەبوڵکردنی کاری دەستەجەمعی (Teamwork) و مومارەسەکردنیەتی لە رووی فۆرم و ناوەرك،و تێکست و رۆحەوە، هەمدیس ئەداکردنی کارەکانە بە هەماهەنگیەکی رێکوپێکی هەڵچنراو لەسەر بنچینەو بنەماو پایە و بەها رێکخراوەییە دیاریکراوەکان (Organized Work).

کاری دامەزراوەیی بەم سروشتەوە تەنیا ئۆپشنێك نییە لە جیهانی ئەمرۆماندا، بەڵکو زەرورەتێکە بۆ مانەوە و پارێزگاری کردن لە بوون، هەر بۆیە کێبرکێکردن لە پێناو پێشکەشکردنی باشتر بە جۆرێکە هیچ شوێنێکی بۆ کاری فەردی (بە مەفهومی ئەفسانەیی) نەهێشتۆتەوە.

کاری دامەزراوەیی بە کردەیی کردنی پرانسیپ و بەها بەرزەکانی ئایینی ئیسلام و وەرگێڕان و شۆڕکردنەوەیەتی بۆ نێو واقیعی ژیانی کۆمەڵگا. هەروەکو هاتووە: (وتعاونوا علي البر و التقوي)، (ان الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا)، (واعتصموا بحبل الله جميعا)، (يد الله مع الجماعة ومن شذ فقد شذ الي النار).. هەروەها گەلێك ماناو دیمەنی تر دووپاتی زەرورەتی کاری دامودەزگایی یاخود دامەزراوەیی لەسەر بنچینە دیاریکراوەکان دەکەنەوە. هەڵبەتە کاری دامەزراوەیی بایەخێکی لە رادەبەدەری هەیە چونکە کارەکان لە فەردیەوە دەگوازێتەوە بۆ دەستەجەمعی، هەروەها لە گەرەلاوژەییەوە بۆ نەخشەدانان، و لە تەمومژاوییەوە بۆ روونبوونەوە، و لە داهاتی سنووردارەوە بۆ فرە داهات، و لە کاریگەرە دیاریکراوەکان بۆ کاریگەرە بەرفراوانەکان، و لەدۆخی دابونەریتییەوە بۆ شەرعییەتی یاسایی.

کەواتە لەسەردەمی ئەمرۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاو بەیەکەوەبەستنی تەواوی جیهان لە رێگای تۆڕی پەیوەندیەکان کە بەرهەمی ئەو شۆڕشە زانیاریە یونیڤێرسالیە گەورەیەیە کە هەیمەنەی بەسەر تەواوی پانتایی دونیادا کردووەو هیچ سووچ و گۆشەیەك نەماوە نەکەوتبێتە ژێر سێبەری ئەم گۆڕنکارییانە.

کەواتە لە سۆنگەی ئەو بایەخ و گرنگەی کە کاری دامەزراوەیی هەیەتی،حیزبی سیاسی بەبێ بوونی رێکخستنێکی بەهێزی رەگداکوتاو کە بەشێوەیەکی دامەزراوەیی کاریگەرو هەماهەنگ و گونجاو لەگەڵ یەکتری و نەخشە بۆ کێشراو کارو چالاکیەکانی رادەپەڕێنێت، ناتوانێ وەڵامی مەهامی ئەو قۆناغە بداتەوە کەتیایدا دەژی، جا ئەگەر حیزب لە لوتکەوە لەسەر فۆرمی دامەزراوەیی رەگدانەکوتێ و سەرجەم کاروبارەکان نادیدە بگرێ، ئەوا لە داهاتوودا رەنگدانەوەیەکی مەترسیداری

دەبێت لەسەر کاروانی خەبات و تێکۆشان.

ئەو کارو چالاکیانەی کە لێرەو لەوێ ئەنجام دەدرێت پێویست بەوە دەکات لە کەناڵە فەرمیەکانی حیزب کۆبکرێنەوە لە پێناو گەیشتن بە داڕشتنی نەخشەیەکی سەرتاسەری و گشتی، بۆ ئەوەی هەنگاو بە هەنگاو چالاکییەکان بەرەو پێشەوە بڕوات، جا ئەو سەنتەرە یان ئەو کەناڵە پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری و داتا هەیە لەسەرجەم دەزگاکانی حیزب کە لە بنکەوە دەست پێدەکات بۆ ئۆرگانەکانی سەروو لە پێناو دەستەبەرکردنی توانا و ئیمکانیات لەسەر دانانی پرۆژە دوور مەوداکان، بۆیە بەبێ بوونی ئەم زانیاریە ڕاست و دروست و سەرتاسەریانە ئەوا چەندەها هەڵەو کەموکوڕی ڕوودەدەن کە لەدەرئەنجامدا کاردەکەنە سەر بارودۆخی حیزب یان دامەزراوە گشتیەکە لە ڕووی سەرکەوتن و شکستهێناندا.

لە کاتی تێڕوانینمان بۆ واقیعی ئێستای حیزبە سیاسییەکانی کوردستان لە ڕووی ئەم هەڵسەنگاندن و پێوەرانەوە، دەبینین بۆشاییەکی گەورە لەم بارەیەوە هەیە، لەبەر ئەوەی حیزبە سیاسیەکان لە بواری ڕێکخستنەوە (مەبەست شێوازی ڕێکخستنی سەرجەم ئۆرگانەکانی حیزبە) دوورن لە حەقیقەتی ڕێکخستنی هاوچەرخ بە شێوەیەك پێوەرەکانی ڕێکخستن بەسەرچوونەو بەکەڵکی ئەم ڕۆژگارە نایەن، جا لە کاتێك بەرژەوەندیەکان تێکگیردەبن و جووت نایەنەوە ئەوا مەرجەعییەت بۆ تاکەکەسە نەك ئەو بنەمایانەی کە ڕێکخستنی حیزبی لەسەر دامەزراوە، ئەمەش بێگومان ناکۆکی و کاریگەرییەکی نێگەتیڤی زۆر دەخوڵقێنێت بەسەر خودی حیزبەکەوە. لێرەدا چەند کەسانێك شوێنی دامەزراوەکە یاخود ڕێکخستنەکە دەگرنەوە و هەر شتێکیش لەوانەوە دەربچێت بەناوی دامەزراوەکەوە دەبێت، بێ ئەوەی ئەوەی جێبەجێی دەکەن قەناعەتیان پێی هەبێت، ئەمەش پرسیارگەلێك لە عەقڵ و هۆشی خەڵکی

دەورووژێنێت و ئاراستەی حیزبە سیاسیەکانی دەکەن و هەتا لە ڕووی ڕێکخستنیشەوە ڕەخنەی لێدەگرن بەوەی کە ڕێکخستنی ڕاستەقینە تائێستا لە واقیعدا بوونی نییە، واتە زۆربەی کاروبارەکانی ڕێکخستن وکاری دامەزراوەیی لە ژیانی کردەییدا کاری پێناکرێت و ئەکتیڤ نیە، بەڵکو ئەوە تاکەکەسە هەڵوێست لەسەر پرس و بابەتەکان وەردەگرێ نەك دامەزراوە، بەمەش کارەکان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بەسەر یەکتری کەڵەکە دەبن بەجۆرێك وای لێدێت زۆرێك لە پرسە گرنگەکان هەر لەبیر دەکرێن، و بەدوایدا ناگەڕێن و لێی ناکۆڵنەوە مەگەر لەلایەن ئەو کەسانەوە نەبێت کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەم پرسەوە هەیە ڕەنگە بۆی بگەڕێنەوەو هەڵوەستەی لەسەر بکەن، ئەویش کاتێك لەوانەیە زەمەنەکەی بەسەردا تێپەڕی بووبێ و دەرفەتەکە لەدەست چووبێت.

عەقڵیەتی کوردی بەشێوەیەکی گشتی عەقڵیەتێکە دوورە لە کاری دامەزراوەیی، هەتا ئەگەر زۆرێك لە دامەزراوەش هەبن بەڵام هەر ناوی بێ ناوەڕۆك دەمێننەوەو وەکو مەرجەعی سەرەکی کاریان پێناکەن و بەهەندی هەڵناگرن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی یاخود لاوازی ڕۆشنبیری تەنزیمی (Organizational Culture)، ئەمەش وای لێدەکات توانای ئەوەی نەبێت ڕووبەڕووی مەهام و ئەو پرسانە ببێتەوە کە خودی حیزبەکە یان ڕێکخستنەکە مومارەسەی دەکات و لەگەڵیدا دەژێت، بەڵکو ئەوەی کاری پێدەکرێ و جێی بایەخە تاکەکەسە واتە هەموو کاروبارەکان لە کۆتاییدا هەر بۆ ئەو دەگەڕێنەوەو ئەو هەر بەتەنها هەموو شتێکە لەم ڕێکخستنە یان دامەزراوەیە و هەرخۆشی دەبێتە ئامرو ناهی بەسەر ئۆرگانەکەیدا.

جا ئەگەر واقیعی ئەو ریکخستن و دامەزراوانەی هەن لە گۆڕەپانی کوردستاندا بەهەند وەربگرین، دەبینین

زۆرێك لە ڕێکخستنەکان دامەزراوە یان لیژنەی زۆریان تێدایە، بەڵام لە مومارەسەی عەمەلیدا دەردەکەوێت کە ئەو کەسانەی لەناو ئەو دامەزراوەیە یان ئەو لیژنانەدان، بەهیچ جۆرێك هۆشیاری دامەزراوەییان بۆ خودی دامەزراوەکەی خۆیان نییە و هیچ لە ئەلف و بێی کاری دامەزراوەیی نازانن، بۆیە ئەم حالەتە سەردەکێشێت بۆ کارنەکردن بەم پرانسیپەو تەواو فەرامۆشکردنی، دیارە هۆکاری ئەم تێنەگەیشتنەش لە بایەخ و ئەهمیەتی کاری دامەزراوەیی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو بۆشاییەی کە لە دامەزراوەکە هەیە لەتەك لاوازی ئەزموونی ڕێکخراوەیی لەلایەن ئەوانەی لە دامەزراوەکە کاردەکەن.

ڕەنگە هەندێك هەبن لە ناو دامەزراوەکە لەم ڕووەوە خاوەن ئەزموون بن، بەڵام مەخابن ناتوانن یاخود توانای ئەوەیان نییە کە ئەوانەی لە دامەزراوەکە یان لیژنەکە کاردەکەن ئەکتیڤیان بکەن و بەگەڕیان بخەن، بۆیە لە دواجاردا هەر خۆیان کاروبارەکان ڕادەپەڕێنن بێ ئەوەی هیچ دەستپێشخەریەك بۆ لیژنە یان دامەزراوەکە بەجێبهێڵن بەڵکو بەپێچەوانەوە هەموو شتێك بەخۆیانەوە گرێدەدەن، بەم حاڵەوە دامەزراوەکە دەبێتە شتێکی شکلی بێ ئەوەی کارو چالاکی هەبێت، بگرە سەرجەمی چالاکیەکان بە توانای تاکەکەسی بارگاوی دەبێ و هەر تەنها مۆرکی ئەوی پێوەدەبێت، لە دۆخێکی ئاواشدا ئەم دامەزراوەیە دووچاری کۆمەڵێك ئاریشەو گرفت دەبێتەوە کە لە قسەو قسەلۆکی پاش ملەوە دەست پێدەکات بۆ ساردبوونەوە لە کاروچالاکی و تادەگاتە پەرش و بڵاوی و بچووکبوونەوەو حەسوودی و نەمیمی، بە دوای ئەمەشدا دامەزراوە یاخود لیژنەکە دەبێتە سەرچاوەی لاوازی و فەرامۆشکردن و گەڕانەوە دواوە لە ڕووی کارو تێکۆشاندا لە جیاتی چالاکی و زیندوویەتی و داهێنان و پەرەسەندن و پێشکەوتن.

لە هەمان کاتدا بە پێچەوانەوە زۆرێك لە دامەزراوەکان رۆلێکی نێگەتیڤ دەگێرن لە کوشتنی تواناو وزەی تاکەکان و دۆگماکردنیان، ئەویش بەبیانووی ئەوەی کار بە دامەزراوەیی دەکرێت و نابێ توانای تاکەکەسی لە کارو چالاکی و بڕیارداندا رەنگبداتەوەو زەق ببێتەوە، ئەمەش بێگومان وا لە تاك دەکات بەسەر خۆیدا دابخرێ و گرمۆلە بێتەوە وەکو ئەوەی هیچ توانایەکی نەبێ و تەنها لە رێی دامەزروەکەوە نەبێت، هەروەها بێ ئەوەی هیچ دەستپێشخەری و پێشنیارێکی تاکەکەسی بەکاربهێنرێت و بەهەند وەربگیریت، لەو رووەوە کە تاك بیردەکاتەوەو راڤەو شرۆڤەی خۆی هەیە لە هەمبەر هەرپرس و کارێك کە هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی، ئەوەش هەر تەنها لەبەر ئەوەی بۆنی تاکەکەسی لێدێت و گوایە دژ بە بنەماکانی رێکخستنە، جا ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ تواناکانی تاك پەیتا پەیتا سەردەکێشێت بۆ تەمبەڵی و لاوازبوونی تواناکان تا دەگاتە خاڵێك کە هیچ تواناو وزەیەکی نەماوە لە کارکردن و ئەنجامدانی چالاکی بەمەستی بەرەوپێشچوون و پەرەسەندنی حیزب و رێکخستن.

لەبەر ئەوەی ئەم قۆناغەی ئەمرۆ بە قۆناغی کاری دامەزاروەیی ناسراوە جا ئەگەر گرنگی نەدرێت بە رۆشنبیری دامەزاوەیی، کە بەداخەوە تائێستاش عەقلیەتی رۆژهەلاتی ناوڕاست دوورە لەم جۆرە عەقڵیەتە، ئەوا ناتوانین سەرکەوتن بەدەستبخەین لەسەرجەم بوارەکان، بۆیە هۆشیاری مەعریفی و سوودوەرگرتن لە ئەزموونەکانی مێژوو زۆر پێویستە، هەروەها زۆریش پێویستە هاوسەنگیەك دروست بکەین لە نێوانی دەستپێشخەری فەردی و کاری دامەزراوەیی بۆ ئەوەی هیچ لایەك بەسەر ئەویتر زاڵ نەبێت، لە پێناو ئەوەی حیزبی سیاسی بتوانێت هەنگاوی راست و دروست بگرێتەبەرو بەئاراستەی سەرکەوتن و گەشەکردن بڕوات بەرێوە.



# نرخی مرۆڤێك لای تۆچەندە؟؟!!

وەرگێرانی: م. سامان

ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگیەگی زۆری داوە بە ئینسان ولەچەندین شوێنی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی جوانی پێکردووە و بەرز هەڵی سەنگاندووە و رێزی لێناوە ئەوەتا خوای گەورە دەفەموێت: (ولقد كرمنا بني آدم)واتە: ئێمە رێزمان لە نەوەکانی ئادەم گرتووە گەر خوای گەورە بەو هەموو مەزنیەتی ودەسەلاتەی خۆیەوە رێز لە ئینسان بگرێت زۆر شەرمە بۆئێمە بەچاوی سوك و بێ نرخییەوە سەیری ئینسان بکەین وەك هەندێك لەسەرمایەدارە عیلمانیەکان کە بەئاسانی نرخی مرۆڤت بۆدیاری ئەکەن،بەمەش ئینسان بچوك دەکەنەوە و رێزو حورمەتی ناهێڵن و ئەیخەنە قاڵبێکی مادییەوە و بازرگانی پێوە دەکەن.

**ئەوەتا یەکێك لەزاناکان شیکارییەکی کردووە لەسەر پێکهاتە بنەڕەتییەکانی لەشی مرۆڤێك کەکێشەکەی ١٤٠ رطل بێت پێکهاتەکانی لاشەی بەم رێژەیە دابەش بووە لەجەستەیدا:**

١- چەوری: ئەوەندە چەوری لەلەشدایە کەبەشی دروست کردنی حەوت صابون دەکات.

٢- کاربۆن: رێژەی کاربۆن لە لەشیدا بەشی دروست کردنی حەوت قەڵەم رەصاص دەکات.

٣- فسفۆر: رێژەی کاربۆن لەجەستەیدا بەشی دروست کردنی ١٢٠دەنکە شقارتە دەکات.

٤- ئاسن: ئەوەندە ئاسن لەلەشدایە کە دەتوانرێت بزمارێکی قەبارەمامناوەندی لێدروست بکرێت.

٥- حیبر: رێژەی کاربۆن لەجەستەیدا بەشی سپی کردنەوەی کولانەی مریشکێك دەکات.

٦- کبریت: ئەوەندە کبریت لەلەشدایە کە دەتوانرێت جەستەی سەگێکی پێ پاك بکرێتەوە.

٧- ئاو: رێژەی کاربۆن لەجەستەیدا بەرمیلێك پڕدەکات کە ١٠ گاڵۆن ئاو بگرێت.

ئەگەر هەموو ئەم مادانەش کۆبکەینەوە دەتوانین لە بازاڕدا بە (٥٠) هەزار دینار بیان کرپت،ئەمە نرخی مرۆڤێکە ئەگەر بەتێروانینێکی مادییانە سەیری بکرێت.

هەربۆیە گەورە سەرمایەدارە عیلمانیەکان پشت بەم شیکارییە دەبەستن و بەدوای سوکیەتی ئینسان دا دەگەڕێن چونکە لەسەربنەمای جەستە ئینسان هەڵدەسەنگێنن،بە پێچەوانەوە خوای گەورە رێزی تایبەتی لێدەنێت چونکە لەسەربنەمای رۆح هەڵی دەسەنگێنێت و دەزانێت رۆحێکی پاکی هەیە(کەبەشێکە لەرۆحی خۆی) جەستەش قابیلی رزانە(دوای مردنی).

# نامەوێ ببمە بکوژی منداڵەکەم

و: ئیمان ناصح دەرەشیشی

﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾

البقرة: ٢١٦

**لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن**

ساڵانێکی دوورو درێژبوو چاوەڕێی هەواڵێکی لەم جۆرە خۆشی دەکرد، وەك ئەوەی بڵێی قاچەکانی لەسەر زەوی بڕاونەتەوەو بە ئاسماندا دەفڕێ. دەی ویست خێرا ئەم موژدەیە بدات بە هاوسەرەکەی، دایکی، خزمەکانی، هەموو ئەو کەسانەی کە ئاگادارو هەڵگری خەمەکانی بوون.

بە پەلە پەل بە قادرمەی نەخۆشخانەکەدا دەهاتە خوارەوە، هەر کەسی دەبینی زەردەخەنەیەکی بەڕوودا دەکرد. دەستی کرد بە جانتاکەیداو ٢٠ هەزاری دا بەو منداڵە سواڵکەرەی کە لەبەردەرگای نەخۆشخانەدا دانیشتبوو.

منداڵەکەش لە سەرسوڕمان و خۆشیدا چاوەکانی وەك ئەوەی فلاشی لێبدەی کرایەوەو هاواری کرد: ئەمە زۆر نییە دادە؟

ئافرەتەکە بە زەردەخەنەیەکەوە خێرا چووە ئەو بەری شەقامەکەو دەستی لە تاکسییەك ڕاگرت و بەرەو دوکانی هاوسەرەکەی بەڕێ کەوت.

کاتێ گەیشت بە جۆش و خرۆشەوە خۆی کرد بە دوکانەکەدا لەکاتێکدا کە پڕیش بوو لە موشتەری، هاوسەرەکەی بەبینی ئەم دۆخە پرسی: چی ڕوویداوە خەدیجە؟

خەدیجە: پێویستە بابەتێکی زۆر گرنگت لەگەڵ باس بکەم، لێرەشدا کە نابێت.

هاوسەرەکەی لە دڵەڕاوکێیەکی زۆردا بوو خێرا لەگەڵ خاتوونی خێزانی بەرەو باخچەیەکی نزیك ئەو ناوە بەڕێ کەوتن، خەدیجە خانمیش لە هەوڵی ئارام کردنەوەی مێردەکەیدا بوو وتی: موراد گیان، ئێستا ئارام بە، من هەواڵێکم بۆت هەیە! کاتێ بیستت تکایە بەهیچ شێوەیەك هاوار مەکە.

بەم قسانە زیاتر هاوسەرەکەی توشی خەمباری و ڕاڕایی کرد و وتی: دەی ناتەوێ پێم بڵێی کە چی ڕوویداوە؟

خەدیجە خانم بە چرپە نهێنییەکەی بە گوێی هاوسەرەکەیدا چرپاند: من دووگیانم.

هاوسەرەکەی سەرەتا وەستا، پاشان: ئای خودایە سوپاس بۆ تۆ.

دەستی کردن بەهاوار کردن هەروەك منداڵێك بەرز دەبوویەوەو لە شوێنی خۆی نەدەوەستا جار جاریش هاواری دەکرد. دەی ویست ئاشکرای بکات بە هەموو دونیادا کە ئەو دەبێت بە ''باوك''، خەڵکی ناو پارکەکەش لە بیستنی هات و هاواردا سەریان بەرز دەکردەوەو زەردەخەنەیەکیان بەڕووی خەدیجەو مورادا دەکرد.

موراد: خەدیجە من تەنانەت لە یادیشم کرد، ئەوە چەند ساڵە ئێمە چاوەڕێی ئەم منداڵە ئەکەین؟

خەدیجە: ١٠ ساڵە، ١٠ ساڵە مورادەکەم.

دەستبەجێ موراد دەستی کرد بە تەلەفۆن کردن بۆ دایکی و تەواوی خزمە نزیکەکانیان خەدیجە خانمیش لەولاوە

بە ڕشتنی فرمێسکی خۆشی تەماشای هاوسەرەکەی دەکرد.

وەك ئەوەی خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانی هاوسەری خەدیجە بێت هەرچی بویستایە لەبەردەمیدا ئامادە ئەبوو، نانی بەیانیشی بۆ دەهاتە سەر پێخەفەکەی، ئەو شتەی داوای بکردایە جارێکی تر نەی دەوتەوەو یەکسەر بۆی ئامادە دەکرا هەم لە ڕاڕاییو هەم لە دڵ خۆشیدا ژیانی دەگوزەراند.

وەك بڵێی لە ساتێکدا کۆتایی بەکێشەکانی هات لەگەڵ خەسوویدا، وەك دایك و کچییان لێ هاتبوو.

بە مەبەستی پشکنین لە تەمەنی ٣ مانگی دوگیانییدا خەدیجە سەردانی دکتۆری سۆنەری کرد، کاتێك دکتۆرەکە خەریکی سەیرکردنی منداڵەکە بوو لەپڕ ڕەنگیی ڕوخساری گۆڕا.

دکتۆر بە نیگەرانییەکەوە بانگی موورادی کرد، خەدیجەو هاوسەرەکەی زۆر دەترسان بەخۆیان دەوت تۆ بڵێی چی ڕوویدابێت؟

دکتۆر: نامەوێ نیگەرانتان بکەم، بەڵام پێویستە ڕاستییەکانتان پێ بڵێم، ئەم منداڵە وەرەمێك لە مێشکیدایە، گەر لە دایك ببێت دەبێتە هۆی کەمی ژیری، گەر دەتانەوێ هەر ئێستا لە باری دەبەم، یان دەتوانن هەفتەیەك بیربکەنەوە پاشان بڕیاربدەن.

خەدیجە لە شوێنی خۆی تەواو دونیا ڕوخا بەسەریدا هاوسەرەکەشی ئەوەندە توشی دڵەڕاوکێی و خەم هاتبوو تەنانەت چاویشی خەدیجەی نەدەبینی.

ئەو ماڵەی لە پێکەنینی خۆشیدا دەنگی دەداوە لەپڕێکدا مات و کپ بوو هیچ کەس تەنانەت وشەیەکیشی لە دەم نە ئەهاتە دەرەوە.

ئیدی وردە وردە هەواڵەکە بەتەواوی خزم و دۆستاندا بڵاو بوویەوە، هەرکەسیش لای خۆیەوە پێشنیارێکی بۆ دەکردن.

لەلایەك دەیان وت: چۆن دەتوانی بەدەمییەوە بیت، ئێمە وا ناتوانین ئاگامان لە منداڵە مێشك لە سەرەکاندا بێت، بڕۆ لەباری بەرە...

لەلایەکی تر: بڕۆ قسە لەگەڵ مامۆستایەکی ئایینی بکە، گوناهە...

هەندێکی تریش دەیان وت: ناتوانی بەرگەی مامەڵە کردنی هەموو ڕۆژێك بگریت لەگەڵی، لە کۆتاییدا هەر دەست دەکەیت بە مامەڵەی ڕەق لەگەڵی، ئەو کات هەموو ڕۆژێك دەبیتە بکوژی ویژدان، یەك جار لەباری ببەو، یەك جار ببە بکوژ...

وایان لێ هاتبوو ئیتر نەیان دەویست نە کەس ببینن نە لەگەڵ کەسیش قسە بکەن بە پێچەوانەی پێشووەوە تەنانەت لەگەڵ یەکیش قسەیان نەدەکرد.

موراد: خەدیجە، پێویستە زوو بڕیار بدەین.

خەدیجە: چی بکەین؟

موراد: بەڕای من لەبار بردن... دوایی دوبارە خودا دانەیەکی ترمان پێ دەبەخشێ...

خەدیجە بەو قسەیە زۆر تورە بوو: یانی ببمە بکوژی منداڵەکەم؟

موراد: بەڵام ئەم منداڵە کێشەی ژیری یانی عەقڵی دەبێت چۆن چاودێری بکەین؟، چۆن لە دەست خەڵکی ڕزگاری بکەین؟، چۆن بڵێین '' ئەمە منداڵەکەمانە''

خەدیجە بە متمانەیەکی زۆرەوە: نەخێر، من ساڵانێکە داوای ئەم منداڵە دەکەم لە خودا. ئێستا وا پێی بەخشیوین و تاقیمان دەکاتەوە، موراد گیان تکایە با لەباری نەبەم...

موراد: خەدیجە من منداڵێکی کەم عەقڵم ناوێت.

خەدیجە بەدەم فرمێسکەکانییەوە وەڵامی دایەوەو وتی: ڕازی نیت بەوەی خودا پێی بەخشیوویت، بیرتە چەندە دڵ خۆشبوویت بەوەی دەبوویتە باوك، ڕەنگە ژیر بووایەو بێ خێر دەربچوایە.. ئەو کات دەمان وت '' خۆزگە کەم عەقڵ بووایە و بەڵام بێ خێر نەبووایە''، کێ دەزانێ ئەمە بۆ ئێمە خێرێك نییە.تکایە با نەبینە بکوژی منداڵەکەمان.

ئەو شەوە بەدرێژایی کات خەدیجە لە خودا پاڕایەوە، گریا، داوای لە خودا دەکرد: یا ڕەب، مەمخەرە ناو وسیتی نەفسمەوە، ڕێگەم مەدە هەستم بەجێ بەجێ کردنی قسەی خەڵك و ببمە بکوژ، هێزم پێ ببەخشە تا بەرگە بگرم، بێگومان شیفا هەر لای تۆیە.

شەو ڕۆشت و بەیانی هات... موراد: گەر منداڵەکە لەبار نەبەیت ئەوە لەیەك جیا ئەبینەوە.

ئەم قسەیە هێندەی تر دونیای ڕوخاند بەسەر خەدیجەدا، بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامێك بکات لە خەدیجە خێرا دەرگاکەی کێشا بەیەکداو چووە دەرەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکەی، لە خەیاڵی خۆشیدا دەی وت: من لە تۆ جیا نابمەوە خەدیجە، جیا نابمەوە. بەڵام ئەمەوێت تۆ ئەم منداڵە لەبار بەریت، لەباری بەریت.

ئیدی خەدیجە کەلوپەلەکانی کۆکردەوەو بەرەوماڵی باوکی ڕۆشت. لەوێ بابەتەکەی بۆ دایکی باسی کرد.بەڵام ئەوەی چاوەڕێی نەدەکرد ئەوە بوو دایکیشی هەمان بۆچوونی هەبوو: مێردەکەت ڕاست ئەکات، تۆ نازانی کە ئێوە چەندە حەسرەتی منداڵێکتان بوو.

لەولاشەوە نەنە شەفیقە بە دەم خوێندنی قورئانی پیرۆزەوە گوێی لە دەنگی قسەکانیان بوو، وەختێ دایکی خەدیجە بەرەو چێشتخانە چوو دایە گەورەی چووە لای و سەری خەدیجەی خستە سەر ڕانی و وتی: کچم ئەوەی ڕۆح دەبەخشێ خودایە، وەرگرتنەوەشی مافی ئەوە، مەترسە. خودا بارێك ناخاتە سەرشانی کەسێك کە بۆی هەڵنەگیرێ. کەوایە تۆ ئەمەت بۆ هەڵئەگیرێ بۆیە پێی داویت.ڕەنگە ڕەزامەندیی لەمەدا شاراوەبێت، ئارام بگرەو مەبە بە بکوژ.

لەپاش بڕیاردانی، خەدیجە چووە لای دکتۆر و پێی وت: دەمەوێت منداڵەکەم بژی، ئایا هیچ مەترسییەکی بۆ تەندروستیم ئەبێت دکتۆرە خانم؟

دکتۆرە: نەخێر، دوگیانییەکەت نۆرماڵە، یانی وەك منداڵێکی ئاساییە.

خەدیجە: کەوایە لە باری نابەم

پەیوەندی کرد بە هاوسەرەکەیەوەو زۆر بەدڵنیاییەوە وتی: بەدڵنیاییەوە دەمەوێت منداڵەکەم لە دایك ببێت،

دەترسم لەوەی گەر ئەو کارەم نەکردایە بەرپرسیاربوومایە لەلای خودا، وە من ڕازیم بەم قەدەرە...قسەکانی تەواو کردو تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

لە دوای تەلەفۆنی خێزانەکەی پەشیمان بوو لە قسەکانی لەوەی کە گوێی لە کەسانی چواردەوری گرتبوو، بڕیاری دا کە گوێ لە دەنگی ویژدانی بگرێت پاشان بڕیار بدات.

ئێوارە بەرەو ماڵی خەزووری بەڕێ کەوت، چەپکێك گوڵیشی بۆ خەدیجە ئامادە کردبوو لەگەڵ تێبینییەك کە لەسەری نوسرا بوو: منیش ڕازیم بە قەدەری خۆم

دوای تێپەڕ کردنی ٦ مانگ بە ترس و لەرزەوە، ئیدی کاتی لە دایك بوونی منداڵەکە نزیك ببوەوە.

هەم خەمباری چ دڵخۆشی، لەرزو ترس، بێتاقەتی و نیگەرانی یانی هەموو هەستەکان کۆببونەوە.

لە دوای ٤ کاتژمێر لە چاوەڕوانی لە کۆتاییدا موراد لە هۆڵەکەدا بەدەنگی هاواری کۆرپەکەی ڕاچڵەکی

دەستەکانی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان: خودایە خۆشەویستیت و ئارامیتمان پێ ببخەشە، یارمەتیمان بدە تا یاخی نەبین.

لەپڕ بە دەنگی هاواری پەرستارەکە نزاکانی بڕی کە دەی وت: موژدە بێت کوڕتان بووە.

بە هەردو دەستی فرمێسکەکانی سڕی و منداڵەکەی گرتە ئامێز، لەناکاو زریانی خۆشەویستی لەناخیدا هەڵی کرد ماچێکی کوڵمەکانی کرد، لەپڕ بەبێ ویستی خۆی وتی: بەخێرهاتی ئەی صابر.

بە دەمدا هاتنی ئەو ناوە توشی سەرسوڕمانی کرد، بەخۆی وت: بەڵی ناوی صابرە

ڕۆژی دواتر شیکاری تەواو بۆ منداڵەکە کرا، دکتۆر بە شڵەژان و لەهەمان کاتدا دڵخۆشییەوە خێرا بەرەولای خەدیجەو موراد ڕۆشت و ئاگاداری کردن کە: مژدە بێت، منداڵەکەتان زۆر سەلامەتە، وەك ئەوەی ئێمە بیرمان دەکردەوە کەمی ژیری نییە.

ئەم هەواڵە فرمێسکی شادی بەچاوی هەمووانـدا هێنایە خـوارێ، مورادیش دەستی کرد بە گریان بە شەرمێکەوە دەپاڕایەوە: خودایە من ببەخشە، لێم خۆشبە.

ڕووی کردە خەدیجەو پێی وت: گەر بەهێزی ئیمانی تۆ نەبووایە گەر سووربون لەسەر بڕیارەکەت نەبووایە ئەوا ئێستا دەبوومە بکوژی منداڵەکەم، تۆش لێم ببورە.

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٨٦

**خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانایی خۆی نەبێت، هەر کارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی (هەر بۆیە ئیمانداران دەڵێن): پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لە دەست قەوما، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا؛ ئەرکێك مەدە بەسەرماندا لە تواناماندا نەبێت، تووشی بەڵاو ناخۆشییەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ ببڕێت، گوناهمان بسڕەوە و چاوپۆشی بکە لە هەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە، (داواکارین) بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحممان پێ بکە، هەر تۆ پشت و پەناو یاریدادەری ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا**

موراد: بە هەردوو دەستی فرمێسکەکانی سڕی و منداڵەکەی گرتە ئامێز، لەناکاو زریانی خۆشەویستی لەناخیدا هەڵی کرد ماچێکی کوڵمەکانی کرد، لەپڕ بەبێ ویستی خۆی وتی: بەخێرهاتی ئەی صابر

موراد: ڕووی کردە خەدیجەو پێی وت (گەر بەهێزی ئیمانی تۆ نەبووایە گەر سووربون لەسەر بڕیارەکەت نەبووایە ئەوا ئێستا دەبوومە بکوژی منداڵەکەم، تۆش لێم ببورە).

# سروشت لای من

محمد نازم

مرۆڤـی دەورە دراو بـە خۆشـی و ناخۆشـی و مرۆڤ و ماددەو سروشت و چەندان سـەیرو سـەمەرەی تر کە وەك مرۆڤ سـەیر نیـن!! هەمیشـە مامەڵە دەکات، کـە هەریەکەیان کاریگەری خۆی هەیە لەسەری.

مامەڵەم لەگەڵ سروشـت ماهیەت و گرنگی تایبەتی خـۆی هەیە، بەجۆریك دەکریـت بڵیـم زۆرم خـۆش دەوێ، کە هەمـوو جـار وام لێدێـت مامەڵەیکـی دۆسـتانەی لەگەڵـدا بکـەم، زۆر لێـی ئەروانـم، ئاسـوودەم لەگەڵـی، وەلێ بۆ ساتێکیش حەز بە دابڕان ناکەم لەگەڵی، هەروەك چۆن ئەو کاتانەشی لێی دوورم ئارەزوی گەڕانەوە دەکەم بۆی.

چـوون هەسـت ناسـکی و جوانی و هەسـت کـردن بە جوانـی و تێرامان و ورد بونـەوە لـە جوانیەکانی سروشـت هەسـتێکی جیـاوازت پێ دەبەخشـێت جیـاواز لەهەمـوو هەسـتێکی ماددی و رەق و تەنانەت جیاواز لەو هەسـتانەی مرۆڤەکان پێت دەبەخشن، دەکرێت بڵێم مەگەر سـۆزی دایك هێندەی سروشـت ناسك بێت.

بە بۆچونی من هەندێك لە مرۆڤەکان شـایەنی ئەوەن هاوڕێی سروشـت بن!! چوون هەموو مرۆڤەکان شایەنی نین!

سروشـت ئـەو شـتەیە دڵ و رۆحی مـرۆڤ هێشـتا بـە تینویەتـی بـۆی دەمێنێتەوە، ئەو کەسانەی مامەڵەیەکی ماددی رەقیان هەیە لەگەڵ سروشت لەم دەربڕینە ڕۆحیانە تێناگەن.

ئاخـر سروشـت بۆخـۆی چەندین مامۆسـتایە، هەموو سـاتێك دۆسـتێکە بەدیهێنەرمان وەبیـر دەهێنێتەوە، ئەو کاتـەی لە ناسـکی پەڕی گـوڵ دەروانم یاخوود لە بەرزایی چیایەکدا لەو هەموو دۆل و دارو سـەوزاییە ئەروانـم، یان لە کەنـاری ئاوێکدا دائەنیشـم و چەندین

# ئەتەکێتی بەخشینی دیاری



ئا: یاسین ئەحمەد زەنگەنە

دیاری لەروانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و داب ونەریتی رەسەنەوە کاریکی خوازراو و دروستە، هەروەك پێغەمبەری ئازیز ( صلی الله علیه وسلم ) لەم بارەیەوە فەرمویەتی (تهادوا تحابوا).

دیاری پەیامێکی ناسکەو مانایی سۆز و خۆشەویستی دەگەیەنێت، و یارمەتی توند و تۆڵ کردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان دەدات لە نێوان کەسوکار و هاوڕێیاندا، هەر بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام جەختی لەسەر دەکات . بۆ ئەم مەبەستە ئاماژە بەسەر دێڕی چەند خاڵێك دەدەین سەبارەت بە ئەتەکێتی بەخشینی دیاری بە هیوای سود بینین و پابەندبوون پێوەی:

* گەر دەتەوێت دەوربەرەکەت هەست بەوە بکەن کە بایەخیان پێ دەدەیت، ئەوا دیاریەکی سادەیان پێشکەش بکە، تا بزانن کە جێ بایەخی تۆن.

* گرنگ نییە دیاری گرانبەها بێت، بەلام پێویستە سەرنج راکێش و کاریگەر بێت، دەشێت دیاریەکە سادە بێت، بەلام وێنەیەك بخاتە روو، ئاستی رێزت لای ئەو کەسە دەربخات.

* دەکرێت دیاری پێشکەش بکرێت لەهەموو بۆنەکاندا، وەك یادی لەدایك بوون، ژنهێنان، وە دەکرێت بەبێ بۆنە دیاری ببەخشیتە دۆست و هاوەڵێکت کە پێویستی بەیارمەتی هەیە.

* هەڵبژاردنی دیاری بەپێیی بۆنەو کەسایەتی و تەمەن و رەگەز دەگۆڕێت.

* دەشێت پرسیار لەکەسەکە بکەین حەز بە چ جۆر دیاریەك دەکات.

* چەپکە گوڵ وەك دیاری شیاوە بۆ هەموو کات و بۆنەیەك بۆسەردانی و داوەت و سەردانی نەخۆش و پیرۆزبایی و... هتد.

* گەر لەبۆنەیەکدا دیاریەکیان پێ بەخشیت ئەوا بە خەندەو رەزامەندی و سوپاس و خۆشحاڵیەوە بەدەمیەوە بچۆ .

* گەر ویستت دیاریەك بکرِیت بۆ کەسێکی دیاری کراو، هەوڵبدە بزانی ئەو کەسە حەزلەچی دەکات و پێویستی بەچییە ؟

* لەکاتی کرینی دیاریدا لەپاکەتی گونجاوو شایستەدا، بەجوانی بیپێچەرەوە، بە پێیی سروشتی شتەکە.

* گەر ئەو کەسەی دیاریەکەی پێشکەش دەکەیت کەسایەتیەکی رۆمانسی بوو، چاك وایە دیاریەکە جوانیەکی تایبەتی هەبێت و ناسکی و رۆمانسیەتی پێوە دیاربێت.

* گەر ئەو کەسەی دیاریەکەی پێشکەش دەکەیت کەسێکی کرداری بوو، چاك وایە دیاریەکە بەهادار و سودی کرداری هەبێت و بتوانرێت بەکاربهێنرێت بە بەردەوامی لە ماڵ و ئۆفیسی کاردا.

* گەر کەسایەتیەکی پارێزکار بوو، چاك وایە دیاریەکە خۆشەویستی نیشتیمان و خاك و نەتەوەی پێوە دیاربێت و، جێ پەنجەی مێژوویی رەسەن لەخۆبگرێت، بەشێك بێت لەکەلەپوری نیشتیمانی ولاتەکە.

* گەر کەسایەتیەکی رۆشنبیر بوو، چاکترین دیاری بریتیە لەکتێبێك یان چەند کتێبێکی دەگمەن، یان بەشداری سالانەی گۆڤارێکی رۆشنبیری ئەدەبی تایبەت بە پێیی ئارەزووی ئەدەبی و زانستی کەسەکە.

* دیاری هەرچەندە تایبەتمەندێتی

تێدا بێت ئەوەندە کاریگەرێتیەکەی زیاترە. بۆ نمونە دڵخۆشی ئافرەت بەگوڵ زیاترە لە دیاری گرانبەها، چونکە ئافرەت عاتیفیەو هەستی دەبزوێت بۆ شتی وا، بەڵام پیاوان حەزیان زیاتر لە دیاری مادی بەسودە.

* چاك وایە دیاری جۆرێکی باش بێت و ئەو کەسەش پێویستی بەو جۆرە دیاریە هەبێت.

* پێویستە رەچاوی چۆنیەتی پێشکەشکردنی دیاری بکەین، لەوانە رەگەزی( کوت و پڕی ) لە پێشکەشکردنیدا، چونکە جوانترین شت لای مرۆڤ ئەوەیە کە ئازیزێکی لەناکاودا دیاریەك یان بەخشینێکی مادی یان مەعنەوی پێ بگەیەنێت.

* لەکاتی بەخشینی دیاریدا نرخی دیاریەکە لابدە، لەسەر دیاریەکە، چونکە ئەمە مەرجێکی سەلیقە جوانیە، بونی نرخ لەسەر دیاریەکە وەك ئەوە وایە داوای بەهاکەی لێ بکەیت.

* گەر دیاریت بۆ دوو برا یان دوو خوشك، دوو کەسی نێومالیك برد، رەچاوی ئەوە بکە دیاریەکان وەك یەك نەبن، بەڵام هەمان نرخ و بەهایان هەبێت.

* گەر دیاریەکت پێشکەش کرا ناشێت بیگەڕێنیتەوە، یان بیفرۆشیت یان بیدەیتە کەسێکی تر.

* بەخشینی دیاری بە منداڵان پێویستە لەگەڵ تەمەن و حەزو خولیاو رەگەزیاندا بگونجێت.

*بەخشینی دیاری بە بۆنەی هاوسەرگیریەوە چاك وایە دیاریەك بێت، بەسود بێت بۆ خانەوادەکە.

* گەر دیاریەکە بریتی بێت لە بڕێك پارە، پێویستە بخرێتە نێو زەرفێکەوەو بەجوانی پێشکەش بکرێت.

* دەکرێت بەچەند شێوەیەك سوپاس و ستایشی ئەو کەسە بکرێت کە دیاری پێ بەخشیویت وەك سوپاس کردن بە ئاخاوتن، یان بە تەلەفۆن، بە نامە، ئیمەیل، هەر هۆکارێکی تر.




بروا وریا بایز

رۆژێك بەردتاشێك کە لەکاری خۆی نارازی بوو و هەستی بەسوکی دەکرد لەنزیك ماڵی بازرگانێکەوە تێپەری. دەرگا کراوەبوو و ئەویش چاوی بەماڵی پڕ شکۆ و باخ و نۆکەرەکانی کابرای بازرگان کەوت و ئیرەیی پێ برد و لەگەڵ خۆیدا وتی: ئەم بازرگانە چەندە بەهێزە! و ئاواتی خواست وەکو بازرگان بێت. لەپڕ دوای ماوەیەك بوو بە بازرگانێکی بەشان و شکۆ تا ماوەیەك وای دەزانی لە هەموو کەس بەهێزترە، تاوەکو رۆژێك حاکمی شار لەوێوە تێپەری، کابرا بینی کە هەموو خەڵکەکە رێز لە حاکم دەگرن، تەنانەت بازرگان بەخۆی وت: خۆزگە منیش حاکم دەبووم، ئەو کاتە لەهەموو کەس بەهێزتر دەبووم! بۆیە دوای ماوەیەك بازرگان بوو بە حاکمی دەسەڵاتداری شار لەکاتێکدا لەسەرتەختێکی تایبەت دانیشتبوو و خەڵکی رێزیان لێ دەگرت، هەستی کرد کە تیشکی خۆر ئازاری دەدات، بیری لەوەکردەوە کە خۆرە تاو چەند بەهێزە.

ئەو هیوای خواست کە خۆر بێت خێرا بووبە خۆر هەوڵی دا بەهەموو توانای خۆی زەوی گەرم بکاتەوە پاش ماوەیەك هەورێکی گەورەو رەش هات و پێشی بە تیشکەکانی گرت کە ئینجا بەخۆی وت هێزی هەور لەخۆر زیاترە بۆیە دەست بەجێ بوو بەهەورێکی گەورە، هیندەی پنەچوو کە بایەك هات و پاڵی پێوەنا بۆ ئەملاو ئەولا، ئەمجار ویستی ببێت بە (با) بۆیە خێرا بوو بە (با) بەڵام کاتێك لە تاشە بەردێك نزیك بۆوە ئیتر توانای جوڵاندنی تاشەبەردی نەبوو. بەخۆی وت بەهێزترین شت لە دنیادا تاشە بەردە خێرا بووبە بە تاشەبەردێکی گەورە،هەروەك سفت و سۆڵ وەستابوو لەپڕ گوێی لەدەنگێك بوو هەستی کرد وا خەریکە ورد دەبێت سەیرێکی خوار خۆی کرد و بەردتاشێکی بینی کە بەچەکوش و قەڵەم کەوتۆتە گیانی!



# بخوێنەوەو چێژ وەربگرە

ابراهيم برهان

**گلەوگازندەی کتێب بۆ نەوەی سەدەی بیست ویەکەم.**

کتێب بەزمانی حاڵ پێمان دەڵێت: منم ناوت بەرزدەکەمەوە و لەپشت هەر سەرکەوتنێکی گەورەی تۆدام،منم چرای هزروبیرت ڕووناك دەکەمەوە، هێزت پێدەبەخشم و ئەبمە هۆی بەهێزکردنت لەتوانای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانتدا، بەهۆی منەوە لەخوای گەورەنزیك دەبیتەوە، منم کلیلی زانست وزانیاری، جاران چاکترین هۆگر بووم، هەرکات و ساتێك منیان چنگ کەوتبا وەك برسیەك پەلاماریان دەدام وهێندەی نان و ئاو پێویستیان پێم بوو، ژیانیان لەسایەو سێبەرم بەسەردەبرد، بەلگەم بۆ ئەم قسانە ئایا کەس لەئێوە هەیە ناوی (جاحظ)ی گەورە زاناو نوسەری نەبیستبێ؟ (جاحظ)ی شەهیدی کتێب، تەنانەت لەم پێناوەدا گیانی خۆی بەخشی.

ناوی تەواوی باوکی (عوسمان عەمرو بن بەحر) کە یەکێکە لە گەورە پێشەوایانی ئەدەب، ئیمامی زەهەبی لە کتێبی (سير اعلام النبلاء) وتەی کەسێکمان بۆ دەهێنێتەوە کەلەسەردەمی ئەودا ژیاوە دەڵێت: (نەبینیومەو نەگوێ بیست بوومە هیچ کەسێك وەکو (جاحظ) کتێب وزانستی لاخۆشەویست بێت هەرکاتێ کتێبێکی چنگ کەوتبایە وەکو برسیەك موتالآی دەکرد، بەشێوەیەك تا تەواوی نەکردبا دەست بەرداری نەدەبوو، بەلآم ئەمرۆ وەك دەڵێن: (کەنوێ هات کەون خەلآتن)، ئەمرۆ سەردەمی تەکنەلۆژیاو زانیاریەکان لەگەڵ زۆربوونی میدیاو ناوەندەکانی ڕاگەیاندن وەك (ئەنتەرنێت، فەیسبووك، ڕۆژنامەو گۆڤار، سەتەلایت تەلەفزیۆن ڕادیۆ) ڕێژەی دۆستانم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەدابەزین و کەمبوونەوە دایە، بەلآم تا ئێستا گرنگی خۆمم لەدەست نەداوە، نەوەی سەدەی بیست ویەك خۆیان لەمن تۆراند بەبێ ئەوەی هەڵەیەکم کردبێ، جێگای منیان لەق کردووە ،خۆیان لەمن تۆراندووە ،بێئاگان لەوەی خۆیان و گەلەکەیان بەوە گەشەدەکەن، دەتوانن هاوشان لەگەڵ ولآتە پێشکەوتووەکان بڕۆن کاتێ لێم نزیك بوونەوەو منیان کردە هۆگرو هاورێی خۆیان، بەلآم بەدوورکەوتنەوەیان لەمن دەبنە گەل ومیللەتێکی بێ گیان.

ئەوەت بیرچوو گەر خواردن وخواردنەوە خۆراکی لاشە بێت من خۆراکی گیانم، بەخۆبواردنتان و بێ نیازبونتان بە هەریەك لەمانە ژیانتان لەنگەری تێدەکەوێت هاوسەنگی لەدەست دەدات ناتوانن پەیامی خۆتان بگەیەنن، واوەیلاو کارەسات بۆئێوە ئەگەر نەگەڕێنەوە سەر بەرنامەی نەوەی ڕابردوو، کەخوێندنەوە بەشێك بوو لەژیانیان، چێژی خوێندنەوەی جاران کەلە نەبوونی کتێبدا بڵێین ژیان هیچ مانایەکی نیە، بۆیە هەرچی زووە خۆتان لەگەڵ من ئاشنا بکەنەوەو بمکەنە هاورێ و لێم دوورمەکەونەوە، تاوەکو هەمان هەست و تام و چێژی جارانتان بۆ بگەڕێنمەوە، لەگەڵ روح و ناختان تێکەڵ بم، ئەبێ دروشمی بەکلتورکردنەوەی خوێندنەوە بەرزبکەنەوە،بەشێوەیەکی ئەکتیڤ و زانستیانە موتالآ بکەن، واتەخوێندنەوەکەتان بەپێی پلانێکی پێشوەختەبێ.

پاشان بزانن بۆچی موتالآدەکەن، ئامانجتان چیە لەخوێندنەوە، ئەو موتالآیەی کەدەیکەن دوورو نزیك چ سودێکت پێدەگەینێت، دەتگەیەنێتە کوێ، یا ئەوەتە بەس کاتت بۆ پڕدەکاتەوە. دوای هەموو ئەمانە رژدو سوربوونتان لەسەرخوێندنەوە،بەجۆرێك هیچ رۆژێکتان بەسەردا تێپەرنەبێت کە نەخوێننەوە پەرێکتان ئاودیو نەکردبێت، چونکە ئەگەر تەنها (٣) ڕۆژ لەمن و لە خوێندنەوە دووربیت قسەکانت تام وبۆ ڕەونەقی تێدانابێت، بەلآم ئەگەر ڕووت لەخوێندنەوە کرد زانیاریت بۆ پەیدادەبێ وتوانای قسە کردنت بەشێوەیەکی ڕەوانترو بە بەکارهێنانی وشەی ڕازاوەو جوانتر تێدا بەرجەستە دەبێ، کەواتە هەرچی زووە وەڵامی ئەم پرسارانە ئامادەبکە تاوەکو خوێندنەوەکەت ئامانجێکی هەبێ؟!!!!!

چی بخوێنمەوە؟

بۆچی دەخوێنمەوە؟

لەکوێ بخوێنمەوە؟

کەی بخوێنمەوە؟

چۆن بخوێنینەوە؟

دکتۆر عەبدولکەریم بەکار دەڵێت: (القاريء الجيد لايقرأ كتبا كثيرة لكنة اذا قرأ كتابا قرأه بطريقة جيدة)، خوێنەری باش ئەوە نیە کەزۆر کتێب دەخوێنێتەوە ،بەڵکو ئەگەر کتێبێکی خوێندەوە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك دەیخوێنێتەوە.

# ئامانج وكاریگەری لەژیانی مرۆڤدا

تویژەری دەروونی:
بەختیارئەحمەد

ئەلقەی دووەم



گرنگی چاندنی ئامانج لەقۆناغی منداڵی ولاویتیدا

ئـەوەی زۆرجێـگـای هەڵوێستە لەسەرکردنە لای ئێمەگرنگی نەدانە بە بەهرەو تواناو ئامانجەکانی قۆناغی منـداڵی کەگرنگترین قۆناغـە بۆ جێگیربوونی زانـیاری وئامانجەکان هەروەکوعەرەب دەڵێن: (العلم فی الصغر کالنقش علی الحجر) واتا فێربوونی زانست لە قۆناغی منداڵیدا وەکو هەڵکەندنی نەخش وایە لەسەربەرد، ئێمە دەبینین ناونوسین بەشێوەی هەڵکەندن لەسەرکێلە بەردەکانی گۆڕی مردووەکان بۆچەند سەدەیەك دەمێنێتەوە،لەبەرئەوەشە پێشینانمان ووتوویانە خانووبناغەکەی گرنگە،

بۆمرۆڤیش هەروایە، پەروەردەکردن وچاندنی ئامانجەکان لە قۆناغی منداڵیدازۆرگرنگە.

هەروەك ئاشکرایەئامانجەکانی مرۆڤ بەپێی قۆناغەکانی گەشەو تەمەن فراوانترو زیاتردەبن بۆ وێنە مرۆڤ لە قۆناغی منداڵیەتی ساواییدا گرنگترین ئامانج وپێداویستی تەنها لایەنی فسیۆلۆجییەکانن وەکو خواردن وخواردنەوەو خەو...هتد

منداڵ کاتێ قۆناغی شیرەخۆری تێپەرکردو چوو بۆ باخچەی ساوایان و قۆناغی بنەرەتی وقۆناغەکانی ئامادەیی وپاشان پەیمانگاو زانکۆو خوێندنی باڵا، ئەوا ئامانج وپێداویستەیەکانی زیاترو فراوانتردەبن، پلەپلە بۆسەرجەم قۆناغەکانی ژیان مرۆڤ ئامانج وداواکاری خۆی هەیە، ئەگەرمنداڵێکی باخچەی ساوایان بەجیبسێك یان بسکیتێك ڕازی بێت ئەوا لە بنەرەتی تا قۆناغی ٩ بەشەربەت وکێکیش ڕازی نابێت، ئەگەر تادوێنێ بەباسکیلێك رازی بوبێت ئەمرۆ بەئۆتۆمبیل نەبێت ڕازی نابێت ...

زانایانی دەروونزانی زۆرپێداگیری لەسەرقۆناغی منداڵی دەکەن بۆ دروستبوونی کەسایەتیەکی باش بۆئاینده، بەتایبەتی لەتەمەنی پێنج ساڵیدا، بەڵام ئەمە پێویستی بە پرۆسەیەکی پەروەردەیی هۆشیارانە هەیە، بەتایبەت لەپرۆسەی پەروەردەی خێزان وقوتابخانەدا، چاندنی ئامانج لەم قۆناغەدا گرنگییەکی بێ وێنەو کاریگەری هەیە، بەڵام بەداخەوە کاتێك کۆمەڵگەیەك گەورەکانی بێ ئامانج بژین چ ئامانجێك چاوەروان دەکرێت بچێنرێت لەهزرومێشکی منداڵەکانیاندا؟!

لێرەدا بەشیاوی دەزانم بە نمونەیەك ئەو ڕاستیە نیشان بدەین، کەچاندنی ئامانج لە قۆناغی منداڵیدا چ رۆڵ و کاریگەریەکی هەیە لەسەرمنداڵ وداهاتووی کۆمەڵگە، کاتێك سیناتۆر ئۆباما وەك سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێررا شارەزایانی بواری پەروەردەو گەشەپێدانی مرۆیی بە(پرۆفایل) ژیاننامەی ئۆبامادا چوونەوە تاوەکو بزانن چ هۆکارێك وای لێکردووە پیاوێکی رەش پێست سەرۆکایەتی سپی پێستەکانی ئەمریکابکات، لەقۆناغی سەرەتاییدابووە پرسیاریان لەئۆباماکردووە،کە بە هیوای لەئاییندەدا ببیت بەچی؟ئامانجت چییە؟

لەوەڵامدادەڵێ : دەمەوێت ببمە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەرا ستی دابوو بەسەرۆکیش!!

بەڵام نابێت ئەورۆڵ وکاریگەریە گەورەیەی ئافرەت لەبیربکەین کە لەپشت پەروەردەی ئۆباماوە بوون، چوار ئافرەت زۆرکاریگەریان هەبووە لەسەرپەروەردەی ئۆباماویارمەتی دەربوون، یەکێکیان دایکی بووە، بەراستی دایك زۆرگرنگە، یەکێکیان نەنکی بووە رۆڵی داپیرەی باش بەگێرانەوەی چیرۆکی پاڵەوانەکان کەمترنیە لەهی دایك، یەکێکی تریان هاوسەرەکەی بووە، زۆربەی پسپۆرانی دەروونزانی سەردەم لەوبڕوایەدان کە هاوسەر بۆکەم کردنەوەی خەم ودڵەراوکێ و بەهێزکردنی متما نەی یەکتر زۆرگرنگە بەتایبەتیش کەژن زۆرپشتی پیاوەکەی بگرێت،هەرلەبەرئەوەش لەمێژینەیە ووتویانە(لەپشت هەموپیاوێکی گەورەوەئافرەتێکی گەورەهەیە!!) ئەوەی تریشیان هیلاری کلینتۆن بووە...!!

ئەوە سەبارەت بەقۆناغی منداڵی، مرۆڤ دوای ئەوقۆناغە دەچێتە قۆناغێکی زۆرهەستیاروگرنگ، ئەویش تەمەنی هەرزەکاریە، هەروەك ئاشکرایەئامانج وئارەزووهیواکان زیاتردەبن، لەبەرئەوەی لەم قۆناغەدا لاوو هەرزەکاران هۆشیاریان زیاترەو ئامادەگیان بۆ تێگەیشتن لەشتەکان باشترەو خاوەنی تواناو ووزەیەکی زۆرن..

لەبەر ئەو هۆیانەی باسمانکرد ئێمە بەگونجاومان زانی زیاترتیشك بخەینە سەرقۆناغی هەرزەکاری و بەتایبەتیش قۆناغی گەنجیەتی کەدوای قۆناغی هەرزەکاری دێت، ئەمەلەلایەك لەلایەکی تریشەوەگەنج لەووڵاتی ئێمەدا گرفت گەلێکی زۆری هەیە، دەبێت ئەوڕاستی یە بزانین گەنج ولاوەکانمان گرنگترین توێژی کۆمەڵگەکەمانن و سەرچاوەی ووزەو هەمووشۆڕش و داهێنان وگۆڕانکاریەکانن وئومێدی داهاتوون.

سەرەرای ئەوەش ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگیەکی زۆری بەچین و توێژی گەنج ولاوەکانداوە، ئەگەرچاوێك بەمێژووود ابگێرینەوە لەرِوانگەی قورئانی پیرۆزەوە، دەبینیت زۆربەی پێغەمبەران (علیهم السلام)لە قۆناغی گەنجیەتی دا ڕووبەرووی ستەم وبێدادی بونەتەوە، وەخوا لەبەرچەندگەنجێك یاسای سروشت دەگۆرێت ،ئەگەرسەیری گەنجانی ئەشکەوتی(کهف) بکەین،لە نوستنی ئاساییەوە کەشەوێك زیاترنیە زیاترلە (٣٠٠)ساڵ خەو دەیانباتەوە بە فەرمانی پەروەردگار، تاوانی ئەوان چی بوو؟!

ئەوان تەنهاڕووبەڕووی زوڵم وبت بەرستی بوونەتەوە، وەك خودا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿١٤﴾ ﴾ الكهف: ١٣ - ١٤

واتەبەراستی ئەوانە لاوانێك بوون باوەری پتەووداماەزراویان بەپەروەردگاریان هەبوو هەربۆیە ئێمەش زیاتر لەنورو هیدایەت بەهرەدارمان کردن ئێمەش دڵەکانمان دامەزراندنو ترسمان تێدانەهێشت. بەڵێ گەیشتن بەئامانجەکان نەخشەدانان وکۆچ وقوربانیدانی پێویستە لەسەرجەم قۆناغەکانی ژیاندا....

# پێنج ستراتیجی گرنگ بۆ ژیرانە کارکردن لە بری زۆر کارکردن

**ناصح برزنجی**

ئەمرۆ جیهان بە دوو باڵ دەفڕێت: ئەوانیش خێرایی و داهێنانە، پێویستە مرۆڤ دەرکی ئەمە بکات بۆ ئەوەی شەمەندەفەری جیهان جێی نەهێڵێت.
د. إبراهیم الفقی

لەم ڕۆژانەدا هەر تاکێك و خاوەن کار و بازرگانان و بەڕێوەبەرانی جێبەجێکار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان سەعاتێکی زۆرو د ڕێژ سەرقاڵی کارن، ئەگەر ئێوە ناچار بن سەعاتی زیاتر لە ڕۆژێکی ئاسایی بۆ تەواوکردنی کارەکانتان کار بکەن لە ئەنجامدا کارەکە بە هەڵە ئەنجام ئەدەن، لێرەدا پێنج ستراتیجی گرنگ بۆ هاوکاری ئێوە بۆ ژیرانە کارکردن لە بری زیاتر کارکردن باس ئەکەین:

١- ستراتیجی یەکەم: تەرکیز (ووردبوونەوە )

هەست ئەکەن چەند خولەك لە یەك کاژێری کار بە شێوەیەکی گشتی تەرکیزتان هەیە؟ لەوانەیە ئەم ماوە کەمە بۆ ئێوە جێی تێرامان بێت، لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە کە زۆرترینی کەسەکان ئەتوانن لە نێوان (٥ تا ١٠) هێندە لە کاژێری کاری کاریگەرتر بن، ئەگەر وا دەزانن کە ئەم ووتەیە موبالەغەیە ئەتوانن ئەم تاقیکردنەوە سادە ئەنجام بدەن...

تیانوسێك و قەڵەمێك لە تەنیشت خۆتان دابنێن و دەست بکەن بە ئاگابوون لە ڕادەی تەرکیزتان، هەر کات زانیتان کە لە سەر کارەکەتان تەرکیزی تەواوتان نیە ماوەی ئەو کاتەی کە بیرتان لە سەر خۆ نەبووە بنوسن، ئەگەر ئەم ڕاهێنانە بە باشی ئەنجام بدەی دواتر خۆتان بە باشی ئەدۆزنەوە، ئەگەر ئێوە بتوانن لێهاتوویی دروستبوونی تەرکیزی تەواو لە کاژێری کارتان پەرەپێبدەن لە ڕێژەی بەرهەمهێنانتان سەرتان سوڕ دەمێنیت.

٢- ستراتیجی دووەم: جوڵێنەر

جوڵێنەر: هونەری سوود وەرگرتنە لە پێداویستی و کەلوپەلی زیادکردنی جۆری کار یان سوودوەرگرتن لە کار، ئەم پێداویستیانە ئەکرێت تەکنۆلۆجی بن وەکو :بەرنامە و سۆفت وێری کۆمپیوتەر یان ئەتوانرێت ستراتیجی ڕێکخراوەیی سیستەمە باشەکانی تر بێت، ئێوە ئاسایی لە چ کەلوپەلێك بۆ زیاتر کردنی ئەنجامی کارەکانتان سوود وەردەگرن؟ بۆ نموونە فرۆشیارێك کە لە ڕێگەی سیمینار یان کۆنفرانسی تەلەفزیۆنی شت ئەفرۆشێت ئاشکرایە بەرانبەر کەسێك کە بە تاك شت ئەفرشیت ڕێژەی فرۆشی زیاترە، چ کارێك ئەتوانن ئەنجام بدەن تا کات و زانین یان لێهاتوییتان جوڵێنەری ئێوە بێت؟

٣- ستراتیجی سێیەم: گرنگی هەڵبژاردن

بەشێکی تایبەتی جوڵێنەر گرنگی هەڵبژاردنە، واتە بەکارخستنی کەسانی دیکە بۆ ئەنجامدانی بەشێك لە کارەکانتان تاوەکو کاتتان بۆ چالاکی سوودبەخشی تر ئازاد بێت، با جارێکی

دیکە سەیری نموونەی فرۆشیارەکە بکەین، ئەگەر فرۆشیارێکی تایبەت لە بەستنی گرێبەستی فرۆش شارەزا بێت لەوانە هەستێت بە پێدانی کاروباری فرۆش بە کەسانی دیکە تا بتوانێت وەکو فرۆشیارێك کاتی زیاتر بۆ گرێبەستەکان تەرخان بکات، ئەگەر قازانجی بەرهەم هاتوو لە زۆربونی فرۆش زیاتر بێت لە بڕی پارەی پێشکەشکردن کەواتە ئێوە سیستەمێکی گونجاوتان هەیە.

هەمیشە بیستنی ئەم خاڵە لە نێوان گلەیی خاوەن کار و بازرگانەکان زۆر باوە کە فرۆشیارانیان لە دووربینی بێزارن و لە بارەی ئەوەوە هەستێکی خراپیان هەیە، لە چالاکیە بازرگانیەکان پێویستە کەسی دووربینی پسپۆڕ دامەزرێنن و کات بۆ تیمی فرۆش ئازاد بکەن تاوەکو ئەوان کارێك کە لە توانایاندایە ئەنجامی بدەن.

٤- ستراتیجی چوارەم: بەڕێوەبردنی کات

زۆر جار ئەبیستین کە خاوەن کارەکان ئەڵێن کە ژمارەی کارمەندی بەشی تایبەتی زۆرە چونکە ئەوان هەموو کات کاتێکی زیاتر بە فیرۆ ئەدەن تا کارەکە ئەنجام بدەن، بۆچوونی من پێچەوانەی ئەم بابەتەیە ئەگەر ئێوە ناتوانن لە ڕۆژێکی ئاسایی کارەکەتان ئەنجام بدەن کەواتە لای ئێوە لەوانەیە لێهاتوویی تەرکیز و جوڵێنەر و گرنگی هەلبژاردن وون بێت یاخود بەڕێوەبەرێك کە لە بەڕێوەبردنی کات دا لاوازە.

بەڕێوەبردنی کات هونەری ڕێکخراوەیی خۆتانە تا بتوانن هەموو کارەکانتان لە ڕۆژێکی کاری ستاندەر ئەنجام بدەن، ئەگەر ئێوە بەڕێوەبردنی کات لە گەڵ لێهاتوویی تر تێکەڵ بکەن، دواتر دەتوانن سوودی بەرزتر لە ڕۆژی کار بەدەست بهێنن و پێویستتان بە کاتی زیاد نیە.

ڕێکخستنی ڕۆژی کاری ئەمرۆ لە کۆتایی ڕۆژی پێشتر دەست پێدەکات، ئەگەر ئێوە ئەم کارە لە کاتی پشوودا ئەنجام بدەن مێشکتان یارمەتیدەدرە کە کارامەتر بن، تەخمین کراوە کە ٥٠ لە سەد لە کاتی پشوو بۆ ڕیکخستنەوەی مێشك و ئاراستەکردنی زانین و ئەزموونەکانە لە ماوەی ڕۆژەکەدا.

ئەگەر ئێوە کاری ڕۆژی دواتر بەرنامە ڕێژی بکەن ئەبینن کە ڕێکارە ئاساییەکانی بیرتان لە کاتی پشوودا لە گەڵتان کار ئەکات، و لە بە ئەنجام گەیاندنی بەرنامەکانتان هاوکارە، بنەماکانی بەڕێوەبردنی کات فێر بن و هەموو ڕۆژێك سوودی لێ ببینن..

٥- ستراتیجی پێنجەم: مەیلی قایل بوون لە نێوان چالاکیەکان

دلنیام کە ئێوە یاسای ٨٠/٢٠ ئەزانن کە ٨٠٪ لە ئەنجامی کارتان لە ٢٠٪ ی کۆشش تان بەدەست هاتووە، هۆی ئەوەی کە ئەم پرسە لە بارەی زۆر کەسەوە ڕاستە ئەوەیە کە ئەوان ئەزانن کە کامە کۆششیان باشترین ئەنجامی بۆ بەدەست هێناون ،ئەگەر ئێوە ئەنجامەکان تۆمار بکەن دواتر ئەتوانن یاسای ٨٠/٢٠ بگۆڕن و بۆ ئێوە بە شێوەی کاریگەرتر کار ئەکات، ئەگەر ئێوە لە ڕابردوو ئاگادار بوونایە کە کام ٢٠٪ لە چالاکیەکانی ئێوە باشترین ئەنجامی دەبوو دواتر ئیوە دەتانتوانی خۆتان ڕێکبخەنەوە تا کاتێکی زۆرتر بۆ ئەو کارە تەرخان بکەن، کەواتە قازانجتان لە هەر سەعاتێکدا زیاتر دەبوو .ئەگەر ئێوە تایبەتمەندی ٢٠٪ کڕیارەکانتان کە ٨٠٪ تیجارەتی ئێوە ئەگرێتەوە بزانیبا کەواتە دەتانتوانی ئەو بەشە لە کڕیارەکانتان بکەنە ئامانج.

(فرانك بتگر) بە سوود وەرگرتن لە یاسای ٨٠/٢٠ لە نوێنەرێکی کۆمپانیایەکی داروخاوی دڵنیایی بۆ بەهێزترین کۆمپانیای دڵنیایی لە ئەمریکا گۆڕا کتێبەکەی ئێستاش لە بەردەستدایە و بەهایەکی باشی بۆ خوێندنەوە هەیە.

ستراتیجی ئێوە بڕیاردانە بۆ جێبەجێکردنی ئەم (٥) ستراتیجیەیە بۆ کار، ئێوە ئێستا ئەم (٥)ستراتیجیەتان هەیە، هەموو ئەو کارانەی کە پێویستە ئەنجامی بدەن ئەوەیە کە تەماشابکەن ئەو ڕێگایانەی کە ئەتوانرێ لەمیانەیەوە ئەم ستراتیجیانە بۆ خۆتان و کارتان بەکاربێنن.

**(فرانك بتگر) بە سوود وەرگرتن لە یاسای ٨٠/٢٠ لە نوێنەرێکی کۆمپانیایەکی داروخاوی دڵنیایی بۆ بەهێزترین کۆمپانیای دڵنیایی لە ئەمریکا گۆڕا کتێبەکەی ئێستاش لە بەردەستدایە و بەهایەکی باشی بۆ خوێندنەوە هەیە**

# با بەهاری بین

ڕۆشنا صاڵح



با بەهـاری بین و جیاوازییەکانی یـەك جوانـمان کات نـەك لەغەمدا داغانمان کات.

وەرزی بەهار شاوەرزی ساڵ وەرزێکە پڕەلە جوانی بوژانەوە و ئاودێرکردنی ڕۆح وبیـر وهزرمان تالێی وردبینەوە، شـتی جوانتـر ئەبینیـن وهەسـتی پێدەکەیـن، ئـەوەی مـن دەمەوێـت ئامـاژەی پێبکەم ئەو جیاوازیانەیە کە لەبەهاردا پێش چاومان دەکەون.

هۆکاری جوانکردن وخۆشەویست کردنی ئەم وەرزەن لامان، کەسەرنجی دەشـت وکێـوەکان دەدەیـن هەمـوو ڕازاوەو نەخشـین بە چەندین، جۆر گوڵ وگیـای جۆراو جـۆر وهەروەها درەختەکانیـش هەریـەك بەجۆرێك چرۆدەکـەن ودوبـارە زیندوێتـی خۆیانامان بۆدەسەلمینن.

لـەڕوی ئاوو هەواشـەوە سـەرنج بدە زۆر کات لەگەڵ ئەوەی خۆرەتاوە بارانیشـە ودیمەنـی پەلکەزێرینەش جاروبار خۆی دەنوینیت.

ئەمانـە هەمـوو پێکـەوە دیمەنێکـی شـادی هێنـەرو ئـارام بەخشـمان پێدەبەخشن بەهار ڕازاوە وخۆشەوسـتدەکەن لەلامـان بریـا ئێمەی مرۆڤەکانیش، کەلە زۆر شتدا لەیەك جیاوازین و ئەم جیاوازییەش ئاسـاییە کەهەبێـت لەمرۆڤەکانـدا جیاوازییەکانمـان پێکەوەژیانمانـی جوانتر وپڕلەڕەنگ تر دەکرد.

یەکترمان قبوڵ دەکرد بەجیاوازی بیـر و فکرەکانەوە هانـدەری یەکتر دەبـوون بۆ ئەوەی ئەو بەهرەی کەلە بەرامبـەردا هەیـەو لەخۆماندانییە پـەرەی، پێبدات وولاتمان پێش بخات بە بەهرەکـەی بەرامبەریش بۆئێمە بەهەمان شێوە گەر مرۆڤەکان هەموو یـەك بەهـرەو خولیایـان هەبووایا ئـەوکات، دونیا واپێـش نەدەکەوت، ئـەم بەرەوپێشـچونەی ئێسـتامان ودونیا زدەی بیر وخەیاڵ وبەرهەمی هەمەجۆری مرۆڤەکانـە کەهەریەك بەشێوەیەك، خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە و داهێنانێکیان پێشـکەش بە مرۆڤـەکان کردووە، کەواتە با لەبری ئەوەی بەرامبەرەکانمان ئیسـتیغلال کەین وکارەکانییان بەکەم و بێبایەخ لەقەڵەم بدەین یان لاسای کەسانی کە بکەینـەوە و ببینە کۆپیـان باببینە وهاوکارییـان وهاندەریان بین تاکاری باشـتر بکەن وڵات ئـاوەدان، و ڕازاوە بکەن ونیشتمانیکی بەهاری وهەمیشە ئاوەدانمان هەبێت.



# چیرۆکی قاوەو کوپەکان

و: هاوڕێ یاسین

کۆمەڵێك لە دەرچوانی زانکۆیەك لە زانکۆکان لەماڵی یەکێك لە مامۆستا بەساڵاچووەکەیاندا پێکگەیشتن، ئەوان ساڵانێکی زۆر بوو کورسی خوێندنیان جێهێشتبوو، سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێنابوو لە ژیانی رۆژانەیاندا و ژمارەیەك پۆستی باڵایان وەرگرتبوو وە سەقامگیریەکی مادی و کۆمەڵایەتیان بەدەستهێنابوو.

پاش سڵاو و ئەحواڵ پرسینی یەکدی، هەریەك لە قوتابیەکان باسی بێتاقەتی و نیگەرانی خۆی دەکرد، کە بە هۆی فشاری کار و ژیانەوە توشی دڵەڕاوکێ وپەژارە بوونە.

مامۆستاکە بۆ ماوەیەك بەجێی هێشتن و پاشان گەڕایەوەو لەگەڵ خۆیدا کترییەکی گەورەی قاوەی هێنا لەگەڵ چەند کوپێکی ڕەنگاو ڕەنگ وەك کوپی چینی بەناوبانگ و کوپی میلامین و کوپی کریستاڵ و پلاستیك و کوپی شوشەیی سادە، هەندێك لە کوپەکان لە لوتکەی جوانیدا بوون و لە ڕوی دیزاین و رەنگ و بەهاوە، هەندێکیشیان سادە بوون و لەو جۆرانە بوون کە لەماڵە هەژارەکاندا هەیە.

مامۆستاکە بە قوتابیەکانی وت: فەرموون هەریەك لە ئێوە با لەو قاوەیە تێبکا بۆ خۆی، پاشان قوتابیەکان لەسەر داوای مامۆستاکەیان هەستان بە تێکردنی کوپێك قاوە بۆخۆیان.

مامۆستاکە وتی: تێبینیتان کردوە کە تەنها کوپە جوانەکانتان هەڵبژاردووەو وازتان لە کوپە سادەکان هێناوە!؟

شتێکی سروشتییە هەر کەس لە ئێوە هەوڵی بەدەست هێنانی باشترین شت بدات، ئەمەش بەتەواوی هۆکاری دوودڵی و بێزاریەکانتانە، ئەوەی لەراستیدا پێویستتانە قاوەکەیە نەك کوپەکان.

بەڵام ئێوە کوپە جوان وگرانبەهاکانتان هەڵبژارد، پاشان تێبینیم کردو بینیم هەریەك لە ئێوە چاوی لە کوپی دەستی هاوڕێکەیەتی.

ئەگەر ژیان ئەو قاوەیە بێت، ئەوا پلەو پایەو ماڵ و پێگەی کۆمەڵایەتی بریتین لە کوپەکان.

هەروەها ئەمانەش تەنها کەرەستەو قاپ و دەفرن و ژیان و جۆری ژیان لە خۆدەگرن و تەنها قاوەکەیە ناگۆڕێت و وەك خۆی دەمێنێتەوە.

ئەگەر بە تەنها تەرکیز بکەینە سەر کوپەکان ئەو چێژی قاوەکە لەدەست دەدەین، بۆیە داواتان لێدەکەم دورکەونەوە لە گرنگی دان بە کوپەکان و لە بری ئەوە چێژ لە قاوەکە وەربگرن.

لە راستیدا ئەم دەردە زۆر کەس پێوەی دەناڵێنن، هەندێ کەس سوپاسی خوا ناکات لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیوە، هەمیشە چاوی لەشتی کەسانی ترە، هاوسەرێکی جوان و رەوشت بەرزی هەیە بەڵام باوەڕی وایە کە خێزانی بەرامبەرەکەی باشتر و چاکترە لە خێزانەکەی خۆی، تەماشای ئەو خانوە دەکات کە تێیدا نیشتەجێیە بەخۆی دەڵێت: کەوا کەسانی تر هەیە لە خانوی رازاوەو خۆشتردا دەژین.

لە بری ئەوەی چێژ لە ژیان ببینێت لەگەڵ کەسوکارەکەیدا، هەمیشە بیر لەو شتانە دەکاتەوە بەرامبەرەکەی هەیەتی و دەڵێت بریا ئەو شتانەی کە ئەوان هەیانە منیش هەمبوایە!!

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت (من بآت آمن في سربه معافى في بدنه عنده قوت يومه فكآنمآ حيزت له الدنيآ بآسرهآ) اخرجه البخارى والترمذي وغيرهما.

بەواتای: هەرکەسێ لە نێو خێزان و ماڵەکەیدا ئەمین بێت، لەشساغ و تەندروست باش بێت، خۆراك و بژێوی رۆژانەی هەبێت، وەك ئەوە وایە هەموو دونیای هەبێت.

یەکێك لە داناکان دەڵێت: سەرم لە مرۆڤ سوڕ دەمێنێت!! تەندروستی خۆیان لەدەست دەدەن لە پێناوی کۆکردنەوەی پارەدا و پاشان ئەو پارەیەی کۆیان کردۆتەوە خەرجی دەکەن لە پێناوی چاکبونەوەیاندا، بیر لە داهاتوو دەکەنەوەو ئێستایان لە بیرچۆتەوە، بەمەش نە چێژ لە ئێستا وەردەگرن و نە بۆ داهاتوودەژین.

دەڕواننە کەرەستەو شتی بەرامبەرەکەیان و گوێ بە شتەکانی خۆیان نادەن، بەمەش نە هی بەرامبەرەکەیان دەست دەکەوێت و نە چێژ لەوەی خۆیانیش دەبینن.

بۆ بەندایەتی کردنی خوا دروستکراون دونیاشیان بۆ دروستکراوە تا سودی لێببین، سەرقاڵ و خەریك بونە بەوەی کە بۆیان دروستکراوە، ئەوەشی بۆی دروستکراون فەرامۆشیان کردوە.

جا پێویستە چێژ لە قاوەکە وەربگریت.



# ترس لە لای منداڵ

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر
amirkoy@yahoo.com

منداڵ هەر لەکاتی لە دایك بونیدا وەڵامی کاریگەری دەرەکی دەداتەوە کە دەوری داوە، بەڵام وەڵام بە پێی جۆر و ماوەی کاریگەری دەگۆڕێت، بۆ نمونە ڕوناکی زۆر وا لەمنداڵ دەکات چاوی بەخێرایی بجوڵێنێ، دەنگی بەرز بەرەو گریان و خۆ جوڵاندنی دەبات تا وەکو بەرگری لە خۆی بکات، ئەم ڕەفتارانە سەبارەت بەم ڕوداوانە پێیان دەوترێت ترس.

ترس هەموو جوڵەو دەنگ و گۆڕینی دەنگ و فراوان بوونی گلێنەی چاوو زیاد بوونی لێدانی دڵ، وە هەموو کاردانەوەیەکی جەستەیی بریتی یە لە خۆ ڕزگار کردنی منداڵ لەم کاریگەریە کە هەڕەشە لە ژیانی دەکات .

ترس لای منداڵ لە شێوەی سامێکی قوڵ کە گشت ڕوخساری دادەپۆشێت پاشان لەرزین و هاوار کردن کە لەکۆتاییدا لەرزینی لێوەکان و تەتەڵەی زمانی لێ دەکەوێتەوە .

ترس تەنها لای منداڵ نیە، بەڵکو لای گەورە و پێگەشتوانیش هەیە لە ڕێگەی هەندێك ڕووداو کە وەك هێزێکی کارا لە دروست کردنی کەسێتی و لە ناوبردنی هێزی ژیری ئەو کەسە، هەروەك چۆن ئاراستەی دەکات بەرەو ڕێگەیەکی ڕاست و دروست، وە مەترسی لێ دوور دەکاتەوە.

توێژینەوەکان دەریان خستووە کە ئەو منداڵەی نەترسێ لە دەوروبەر ئەوا لە تاریکیش ناترسێ هەرچەندە دەستیش بدات لە هەندێ گیاندار یان باڵندە یان هەندێ شت. وە دەریان خستووە بوونی دووشت لای شیرە خۆر ترس دروست دەکات بەتایبەتی.وەك بونی دەنگێکی بەرز و نەمانی، وە ئەگەر شتێکی تر بەراورد بکرێت وەك تاریکی یان گیانداریك یان ئاگرێك بەیەکێك لەم دوو هۆکارە ئەوا ترس ڕوو دەدات لە بوارەکانی تردا بە گشتی لەگەڵ دووبارە بونەوەی چەند جارێك، بەم کارە دوترێت ( کاردانەوەی مەرجدار)- هەروەها ترسان لە سەگ هەمان ترسانە لە دەنگی پێش گەستن و پەلامار دانی.

هەر بەم شێوە هەست کردن منداڵ بە ترس و سام، کاتێك بە تەنها جێ دەهێڵرێت بۆ یەکەم جار لە تاریکیدا، خۆ تاریکی هۆکار نیە بەڵکو جیابونەوە و تەنهایی کاریگەری زیاترە لە تاریکی. وە خودی گیاندار جێگەی ترس نیە بەڵکو دەنگی گیاندارەکە بە تایبەت کاتێك دایك و باوك یاری منداڵانی دەخەنە بەردەم و پاشان لاسایی گیاندارەکان دەکەنەوە .

با منداڵێك وەك نمونە وەربگرین کە لەگەڵ دایکیدا دەژی کاتێك دەرگایەکان بەتوندی دادەخرێن وە بەنگی بەرز قسە دەکرێت، ئەگەر بەشێیوازێکی جوان خواردنی پێ نەدا ئەوا زۆر ئاساییە کە دایکەکە خۆی جێگەی مەترسی بێت بۆ منداڵەکە کە بە تایبەت لە کاتی خواردندا، هەر بۆیە زۆرێك لە منداڵان خواردن لە دایکیان وەردەگرن بەڵام لە وەرناگرن، یاخود بەپێچەوانەوە، یاخود منداڵەکە لەگەڵ کەسێك ڕادێت و لێی وەردەگرێت، بەڵام لە کەسانی تر دەترسێت، بە زۆری وایە کە منداڵ لە شتێك دەترسێت کە دەنگێکی بەرزی لێ دەربچێت وە بە دووبارە بونەوەی ئەم کارە دەبێتە ڕاستیەکی چەسپاو لە مێشکی منداڵەکەدا، وە هەندێ ترسی تر هەیە لە دەرونی منداڵەکەدا سەر هەڵدەدات لەگەڵ چونەناو ژیان و ئەرکی خێزانەوە.



# ماسك پۆشەكان

دیار بەكر

ماسك: بە واتای دەمامك، بە كاردەهێنرێت بە مە بەستی خۆ پاراستنی مرۆڤەكان لە مەترسییەكی دیاری كراو، لە ناوچە یان شوێنێكی دیاری كراودا، وە ك مەترسی (كیمیایی، ژینگەیی، تەندروستی.....).

ئەوەی كە بینیتان پێناسەیەكی سادەی (ماسك) یاخود (دەمامك) بوو، بەڵام لە رۆژگاری ئەمرۆدا هەندێك لە مرۆڤەكان بە شێوەیەكی دیكە و بۆ مەبەستی دیكە بە كاری دەهێنن.

بەهۆی ئەو شەپۆلە فراوان و گۆڕانكاری یە هەمە لایەن و گشتگیرانەی كە رووی لە كۆمەڵگاكان كردووە لە رووی (ئابووری، كۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، فكری...)یەوە، هەروەها بە هۆی ئەو پێشكەوتنە بێ ئەندازەیەی كە لە بوارە جیاوازەكانی تە كنەلۆژیادا رویان داوە و بەردەوام بەرەو پێشتریش دەچن، لەهەمان كاتدا بەهۆی گەشەسەندن و زۆربوونی رێژەی ژمارەی دانیشتوان لە كۆمەڵگاكاندا بە شێوەیەكی نائاسایی بەتایبەت لە پاش سەدەی بیستەوە، دەبینین ئەم هۆكارانە تەنگیان بە ژیان هەڵچنیوە و وردە وردە بەها باڵاكان لە ناو كۆمەڵگاكاندا كاڵ دەبنەوە، مرۆڤەكان لەگەڵ ئەوەی خاوەنی زۆرترین سامان و جوانترین تەلارو باشترین ئامێرو ئامرازەكانی سەردەمن بەڵام ئەمانە دادیان نادات و بەردەوام لە نێوان خۆیاندا لە كێبركێ یەكی توندودان و هەوڵ دەدەن زۆرترین وەربگرن بەڵام كەمترین ببەخشن.

بێگومان بۆ ئەوەی براوەی مەیدانەكەش بن بێ گوێ دانە هیچ بەهایەك جۆرەها رێگەو شێواز دەگرنە بەر، یەكێك لەو رێگایانەش كە ئەمرۆ مرۆڤەكان كاری لەسەر دەكەن و بەكاری دەهێنن بریتی یە لە گۆڕینی سیما یاخود (پۆشینی ماسك) ی تایبەت بە بارودۆخە جیاوازەكانە، زۆرێك لە مرۆڤەكان ئەمرۆ بۆ ئەوەی بگەن بە ئامانجە تایبەتی یەكانیان، بۆ ئەوەی بتوانن لە كێبركێ كەدا لە ریزی پێشەوە و براوەكاندا بن، بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر ئەو بوارە ژیاری یە جۆرا و جۆرانەی كە مەبەستیانە، بۆ ئەوەی بە كەمترین ماندوو بوون زۆرترین بەرهەمی ژیانیان چنگ بكەوێت، جۆرەها ماسكی تایبەتی دەپۆشن بەرووی كۆمەڵگەدا، بە شێوەیەك بۆ هەرساتێك ماسكێكیان ئامادەیە، بێگومان ئەمەش خۆی لە خۆی دا ژەهرێكی كوشندە و كارێكی نادروست و ئاكارێكی ناپەسەندە و باجەكەشی تەنها مرۆڤی بەرامبەر و كۆمەڵگەش بەگشتی دەیدات، بۆ نمونە دەبینین ئەم مرۆڤانە لە كاتی كارەسات و كێشە و گرفتی بەرامبەرە كانیان یاخود كۆمەڵگە ماسكی

خەمۆکیان پۆشیوە و بەو جۆرەی کە بیانەوێت نمایش دەکەن، لە هەمان کاتدا ناخیان پڕە لە بێباك بوون لە خەمی دەوروبەر، هەروەها لەکاتی ئاهەنگ و خۆشی یەکاندا باشترین ئەکتەرن لە سەر تەختەی شانۆکە و بەشێوەیەك خۆیان پیشان دەدەن کە ئەو ئاهەنگ و خۆشی یانە شەرەفی بەختەوەر ترین مرۆڤی بەر لە هەرکەس بەوان بەخشیوە، بەلاَم لەهەمان کاتدا ناخیان تاریك و پڕ لە ئازارە و بۆ هەلێك دەگەڕێن تاوەکو رووناکی چراکان بکوژێننەوە و هەستە جوان و دڵە پڕلە خۆشی یەکان لە لێدان بخەن.

مرۆڤە ماسك پۆشەکان هەمیشە لە بۆسەدان و خۆیان لە سەنگەری دژ بە تەواوی کومەلگە دەبیننەوە، هەرگیز گوێ نادەن بەوەی کە لەگەڵ کێ و لە پێناو چی و بۆچی مەبەستێك مامەڵە دەکەن، لای ئەوان تەنها دوبنەما گرنگە یەکەمیان بەدەستهێنانی ئامانج و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، دووەمیان چەواشەکردنی کەسی بەرامبەر بەهەر شێوەیەك بێت بۆ مسۆگەر کردنی ئامانجەکانیان.

کەواتە ئێستا کەم تا زۆر لە مەترسی ئەم جۆرە مرۆڤانە تێگەیشتین، بەلاَم ئەوەی لێرەدا جێگەی داخە ئەوەیە کە ئەم مرۆڤانە بەتەواوی کۆمەلگەدا بلاوبوونەتەوە و دەتوانین بڵێین لە زۆربەی کایەکانی ژیاندا بونیان هەیە، لە هەمان کاتیشدا دیاری کردن یاخود ناسینەوەیان تارادەیەکی زۆر ئەستەم بووە چونکە وەك وتمان مرۆڤە ماسك پۆشەکان لە کۆمەلگەی ئەمڕۆدا زۆرن و هەریەك بە شێوەیەك و لە بوارەکەی خۆیدا رۆڵ دەبینێت.

**کاریگەری یەکانیان لە سەر کۆمەلگە:**

ئەم مرۆڤانە بێگومان کاریگەری گەورە و نێگەتیڤیان هەیە لەسەر کۆمەلگە کە بەکورتی ئاماژەیان پێ دەدەین ئەوانیش:

١- زۆر بوونی دیاردەی چەواشەکاری و فێڵ کردن لە نێوان تاکەکاندا.

٢- کەمبونەوەی متمانە لە نێوان تاکەکانی کۆمەلگەدا، کە ئەمەش کۆمەلگە بەرەو پەرتەوازەیی و داڕوخان و لێك ترازان دەبات.

٣- زۆر بوونی کێشە کۆمەلاَتی یەکان بە هۆی دورکەوتنەوەی بەردەوامی چین و توێژەکانی کۆمەلگە لە یەکتری.

**چۆن خۆمان بپارێزین:**

کەواتە بەرێزان لە دۆخێکی لەم جۆرەدا بۆ خۆ پاراستنی هەریەکێك لە خۆمان لە زیان و مەترسی ئەم جۆرە مرۆڤانە پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرینەبەر:

١- هەڵسەنگاندنی مرۆڤی بەرامبەر،پێش ئەوەی هەر جۆرە مامەڵەیەکی لەگەڵدا بکەین.

٢- بە وریاییەوە مامەڵە بکەین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەردەوام پەیوەندی یان پێوە دەگەین بە هۆی کاری رۆژانەوە بێت یان هەر بابەتێکی لەو جۆرە.

٣- بەستنی دۆستایەتی لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی کە سود بەخشن لەکۆمەلگەدا.

٤- خوێندنەوە ی کەسی بەرامبەر بە پێوەری ئاین و بنەما ڕەوشتی و زانستی یەکان، نەوەك بە پێوەری پلە و سەرمایە.

٥- هەوڵدان بۆ نزیك بوونەوە لەو کەسانەی کە هاوڕاو هاو بۆچوون و هاوتێڕوانینمانن بۆ ژیان.

ئەو خالآنەی کە خستمانە ڕوو چەند هۆکارێکی کورت بوون بۆ خۆپاراستن لە مرۆڤە نمایش کارەکانی ناو کۆمەلگە کە دەتوانێت ڕۆڵی خۆی بگێرێت لە وریا کردنەوە و ئاراستەکردنمان بەرە و دۆزینەوە و ناسینەوەی مرۆڤەکان و جیاکردنەوەی سود بەخش و زیان بەخشەکان لە دەوروبەرو کومەلگەکەماندا بەگشتی.

**لەکۆتایدا:**

پێویستە وریا و چاوکراوەبین و بالآنسی ژیانمان بە شێوەیەکی یەکسان ڕابگرین لە هەموو بوارەکاندا، بۆ ئەوەی هیچ مرۆڤێکی ناخ ڕەش و بێ هەست و هەل پەرست سادەیی و مرۆڤ دۆستی ودڵسۆزی و خۆشەویستیمان بۆ دەورووبەر و کۆمەلگە لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە خراپەکانیدا بەکار نەهێنێت.



# هەستی کانی

**ڕەئوف شوانی**

دەروون ڕەنگین هاوسەرەکەم
ئەی نازکێشی دڵتەنگیم

داستانی جوانی ژیانم
نمە بارانی بە هاریم

هاوخەمی ئازاری ناخم
ئەی تریفەی میهرەبانی

نەمامی باخی بینایم
هەستت پاك هەروەك کانی

ڕۆحم بێ تو خەراباتە
بە تۆوە من ئاوێزانم

پەیامی سۆزو ئەوینم
ڕۆناکی وەرزی خەزانم

شەبەقی پاکژی رازم
شا سێبەری خەونەکانم

بێ تۆ نازیم و بەبێ تۆ
نەکەی بمکەی ڕەنجەڕۆ



# کاروانێك بەرەو نوێبونەوەی ئەندێشەی گەنجان



هاوڕێ چۆمانی

**سەرکردە پیرەکان بەخیلی بەسەرکردە گەنجەکان ئەبەن (نیتچە)**

هەمومان لەسەر ئەوە کۆکین گەنج هێزێکی بەرفراوانی کۆمەڵایەتیە و سەرجەم کایەکانی ژیان بێ بوونی ئەو توێژە چالاك بونێکی ڕاستەقینە و کاریگەر بەخۆیەوە نابینێت.

قۆناغی ژیاری مرۆڤایەتی ئەوە نیشان دەدات ئەرکێکی سەخت و گران کەوتۆتە سەرشانی گەنجان تاوەکو شارستانیەتێکی مەزن و بەهادار بنیات بنێن،نمونە ئەو گەنجانەش گەلێك زۆرن هەر وەك پەیامبەران و پیاوچاکان و سەرکردە میللیەکان و رۆشنبیران و هونەرمەندان.

ئەو توانا و وزەیەی کە لە گەنج بەدی ئەکرێت لەکۆی قۆناغەکانی مرۆڤ بەو شێوەیە نیە چونکە گەنجان لەتوانایان دایە روبەروی ئاستەنگ و تەنگ وچەلەمەکانی ژیان ببنەوە و ئاراستەی بارودۆخەکان بگۆرن و نمونەیەکی تر پێشکەش بە مێژووی مرۆڤایەتی بکەن.

مەبەست لەگەنجبوونی مرۆڤ بریتی نیە لەتەمەنێکی دیاریکراو بەڵکو لێرە خاڵی بنچینەیی بۆ دیاریکردنی گەنج بوون بریتی یە لەو هزروبیرانەی کە ڕاستەوخۆ تاك فرێی دەداتە ناو کۆمەلگا و کارلێکێکی هاوچەرخانەی لێوەبەدەست دەهێنرێت، بۆتێگەیشتن لە گەنجێتی مرۆڤ پێویستە سەیری شێوەی مامەڵەکردن و دەرهاویشتەکان بکرێت بەبێ ڕەچاوکردنی کاریگەرییە لاوەکیەکان.

زۆرینەی جار خەون و خەیاڵی مرۆڤ لەتەمەنی منداڵییەوە گەڵاڵە دەبێت وە گونجاوترین دەرفەتیش بۆ کردنیان بە کردار پاش کۆتایی هاتنە بە بەماوەیی منداڵییەتی هەڵبەتە ئەمەش گەنجێتیە، چونکە ئەوکات دەکرێت زەمینە سازیەکی خێرا بەئەنجام بگەیەنێت و دواجار گەیشتنە بەئامانج.

ئاشکرایە کۆمەلگا پێشکەوتوەکان پڕاوپڕن لە مرۆڤی گەنج بەپێچەوانەی کۆمەلگا دواکەوتوەکان کەسەرلەبەری بەڕێوبەرانی ڕژێمە کۆمەڵایەتی وسیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و تەنانەت بابەتی ئاینیش خاڵی نین لە بیروهۆشی کۆن و لێکچوو لەچاخەبەردینەکان.

هەر رەوتێکی نوێ بێ پاڵپشتی گەنجان ئەستەمە بتوانێت جێی پێی خۆی دابکوتێت هەروەك هەر سیستەمێکی بەرێوەبردنیش لە دەولەت ممارەسەی جۆرێك لە سیاسەت بکات دژ بەخواستەکانی گەنج رووبەری چارەنوسێکی دژوار ئەبێتەوە و دواجار دەچێتە پەردەی نەبوون.

پێویستی گەنجان لە خەبات و تێکۆشان بەستراوەتەوە بەوفاکتەرانەی کە زەمینە خۆشکەرن تیایدا لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکە لەسەرگەنجان دژوارییەکان تێبپەرێنن و ئەو رۆلە ببینین کەوەك بەرپرسیاریەتی مێژووی وایە، هەموو ئەمانەش پالپشتە بە ئیرادەو ورەیەکی بەرزو گەورەیە تا کۆمەلگا لە قەیرانێکی جەنجال بگوازێتەوە بۆ کۆمەلگایەکی بەختەوەر و پرکۆشش و پڕاوپڕ لە ئاسایش و ئاشتی کۆمەڵایەتی.

هێزە سیاسیە کۆنەپەرستەکان لەهەوڵی ئەوەدان گەنج لە هاوکێشە گۆرانکاریەکان داببرێن و لەنێوان گەنجان و بابەتە سەردەمیەکان جیهانێکی نامۆ

دروست بکەن بۆئەمەش پەنا بۆ دوو ئامراز ئەبەن یەکەمیان راکێشان و شوینگرتنەوەیان لەنێوخۆیان ئەمەش جۆرێك لە کارەکتەر بەرهەم دەهێنێت ماناکانی گەنج بەهەموو پێوەرێك نایگرێتەوە،رێگای دووەم هێندەی تر سورمان ئەکات لەسەر ئەوەی بڵێین سیاسیە کۆنەپەرستەکان جگە لەپەیامی ستەمکاری ناتوانن بە هیچ زمانێکی تر لەگەل توێژە جۆراوجۆرەکانی تری کۆمەل بکەونە گفتوگۆ کەئەمەش رەتکردنەوە و رەشکردنەوە و نەخوێندنەوەی دیدی گەنجێیەتی دەگرێتەوە،ئەم ئامرازە لەگەل ئامرازی یەکەم رەنگە تاماوەیەك مەودای هێزە کۆنەپەرستەکان لەسەر شانۆی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی.... هتد درێژبکاتەوە بەلام ناتوانێت لە ئاست دەنگی گۆرانخوازی و نوێخوازی گەنجان تاوەکو سەر وەکو خۆی بمێنێتەوە،گەر هێزە کۆنپەرست و پارێزگارە چەوتەکان هەر زەبروهێزێك بەکاربێنن ناتوانن ئەو ئیرادە پۆلاینەی گەنجان تێك بشکێنن و لەناوی ببەن،لەوانەیە بۆماوەیەك بتوانن بزوتنەوەی رزگاریخوازنەی گەنجان کشومات بکەن یان بۆ بانگەشە و موزایەدە گەنجخوازانەی خۆیان بکەن بەلام ئاینده و بەرێوبەرانی سیستەمی دەولەت بۆ گەنجە راست و بوێرەکانە.

یەکدەنگی و کۆدەنگی وکارکردنی یەکگرتوانەی گەنجان ئەوانە دەگەیەنێتە مەنزلگا وەبەپێچەوانەوەشەوە ناکۆکی و کێبرکێی ناشەریفانە پێش ئەوەی نەیارانیان بەهێز بکات پالنەرێکی راستەوخۆوکاریگەرە بۆ پەرش و بلاوەکردنی خودی خۆیان.

کۆنفۆشیوس دەلێت: ئەو دەستەلاتدارانەی رێز لە رۆشنبیرەکان ناگرن هەژار ئەبن چجای ئەوەی ئەو دەستەلاتدارانەی گەنجان پەراوێزبخەن و مامەلەکردن و گفتاریان دژە گەنج بێت ئەبێت چارەنوسیان کام زبلدانەی مێژوو بێت؟



# لەخۆباییەکی نەزان!

ئومێد عومەر باوەمەردەیی

پیاوێکی لووتبەرزی لەخۆبایی وبێ ئە زموون هە رکەس وکارێکی دەبینی، ڕەخنەیەکی زبرو ڕوخینەری لێدەگرت، دەیوت: تۆهیچ نازانیت!

ئەم کەسە بەهۆی هەڵسوکەوتە قێزە ونەکانیەوە، خەڵکی لێی بێزارونارازی بوون تەنانەت لەنێوماڵ و خانەوادەکەی خۆشیدا.

ڕۆژێکیان تووشی زانایەکی بەهرەمەند بوو، کۆمەڵێك ڕەخنەی توندی بێبنەمای لێگرت، وشەکانی سەراپا لەجێی خۆیدا نەبوو.

بەڵام زاناکە بەئەدەب و نەرم ونیانی وخۆبەکەم زانینەوە سووپاسی کردو وەڵامی قسە بێسەرو بەرەکانی نەدایەوە.

ئەم پیاوە ڕەخنەی لەزانایەکی ترگرت زۆر بە توندی ولەبەرچاوی چەند کەسێك شکاندی، وتی: ئەم باسەی تۆهیچ نەبوو زۆر لاوازە، زاناکە ووتی: هەموو بابەتەکە، وتی: بەڵێ لەوپەڕی بێ کەڵکی دابوو، وتی: بەشێکی زۆری قسەی داناو زاناو فەیلەسووفەکان بوو نەك هی خۆم، بەڵام من و تۆ پێشبڕکێیەك دەکەین، ئەگەرتۆ زانیت ئەوامن دیاریەکی بەنرخت پێ دەبەخشم بەڵام ئەگەر تۆ نەتزانی هیچم لەتۆناوێت، پرسیارەکان بریتی بوون لەمانە:

١- دەتوانیت لەماوەی یەك کاتژمێردا پانزە ئایەت لەبەربکەیت؟ وتی نەخێر.

٢- دەتوانیت دە دێڕ شیعرم بۆبڵێی؟ وتی نەخێر

٣- پێنج ووشەی هاوشێوەی یەك مانام پێ بڵێ کەجیاوازبێت؟ وتی نازانم.

٤- دەتوانی نیو کاتژمێر بەئارەزووی خۆت وتار لەسەر شتێك بدەیت؟ وتی نەخێر.

بۆیە زاناکە ووتی: تۆخەڵك تاقی دەکەیتەوە، بەڵام خۆتت تاقی نەکردوەتەوە، خۆت بەزانا دەزانیت بەڵام (نازانی کەنەزانی).

زاناکە بەتەواوەتی تێی گەیاند کەچەند بێ تواناو بێ زانست و لەخۆڕازی ولەخۆباییە.

بۆیە پێویستە خۆمان بناسین و ڕەخنەکانمان لەجێگای خۆی دابێت ودروست کەر بێت نەك ڕووخێنەر.

# سەرچاوەی بەختەوەری ڕاستەقینە!

نووسینی: عبدالقادر حسین



شاعیر لە ئاست دەربڕین بەسەر سەروەرا، مەست و وێڵە، نووسەر لە ئاست خاتەما، دڵگەرمە، پێنووسەکەی قارەمانە، لە ئاست دەربڕینی خۆشەویست وەك سەرکردەیەکی لێهاتوو لە مەیدانی شەڕدا چالاك و بوێرە، هەر هەنگاوێکی ئەم سەروەرە بۆ ئێمە، شارێگای ڕێی بەختەوەری و سەرفرازیمانە، خۆشەویستی ئەو بۆ ئێمە پێوانە ناکرێت، خۆ دڵە میهرەبان و پڕ سۆزەکەی ئەو لە مێژە پێوانەی خۆشەویستی شکاندووە، ئاخر دڵێك ئەوەندە شەیدای لوتف و لیقای نوور بێت، ئەوەندە خەمخۆرو خەم ڕەوێنی ئوممەتەکەی بێت، هیچ پێوانەیەك بەرگەی پێوانەکردنی ناگرێت، دڵێکی گەرم و مەست، دڵێکی قارەمان و مەرد، دڵێکی ساف و بێگەرد، دڵێك پڕبێت لە میهرەبانی و ئەوین، لە ڕێزگرتن و تەبایی، لە وەفاو بەڵێن، لە یارمەتی بۆ هەژاران، بۆ بێنەوایان، دڵێك بوونیات نرابێت لە سەر ئاکاری بەرز، بوونیاتنەریشی زاتی بێ هاوتاو میهرەبان بێت، لە گەڵ خاتەم وصادقی ئەمین، کە زاتی بێ هاوتا بە بەرزترین ناو، کە ناوی بەندەیە ناوی هێناوە، ئەم دوو زاتە دەبێ چ شارێکی بێ وێنەیان لە ناو ئەم دڵە بوونیاتنابێت، دەبێ چەندە ڕازاوەو دڵگیر بێت، مەگەر جوانیەکانی بەهار دەتوانن هاوتابن، لەگەڵ ئەم دڵە ڕازاوەیە بەنووری ئیمان!!.

ئەی ئەو دڵانەی کە بێنازن، بێزارن، دڵتەنگ و خەفەتبارن، ناتانەوێت بەژداربن لە پرۆژەی شاری ناو دڵی ئەم میهرەبانە! ئەم سەروەرە، ئەم چرایە، پرۆژەکە هێندە فراوانە، گەر بێیتە ناوی نوقمی سۆزو ئەوینی ڕاستەقینە دەبی، نوقمی دەریایەك لە نوورو ڕووناکی دەبیت، تواناکانت چالاك و بەهێز دەبێ، دێیتە سەر ڕێگای کاروانێك، میهرەبانی خودا لێت دانابڕێت، ئەم میهرەبانە کەمەندکێشت دەکات، بۆ دیداری لوتفی پاکی، بۆ دیداری میهرەبانی و پڕسۆزی، بۆ دیداری لیقاو نووری جەمالی، کەواتە گەر دڵێك دڵنەدات بەم میهرەبانە، دەبێ شایستەی هاودەمی چ دڵێك بێت؟! گەر سەرچاوەیەکی هەڵقوڵان نەبێت، ڕووبارەکان، کانیاوەکان، لەکوێوە دروست بوون؟! کەواتە گەر بێزارو خەفتبارو بەئازارین، کەواتە بابزانین دڵمان مەستی چ دڵێکە؟ بابزانین هاودەم نییە لە گەڵ سەرچاوەی دڵێکی نەخۆش، پڕبوو لە لوتبەرزیو بچووکبینی خەڵکی، دڵێکی کلۆربوو بە خۆشەویستی بەئازارو درۆین، دڵێك گرفتاری تێربوونی ئارەزووە گڵاوەکانی هەموو مانای ژیانیەتی، ئەگەر دڵمان خۆشەویست و مەستی ئەو دڵانەی باسکرا نییە، کەواتە با دەستی نزامان بەرزبکەینەوە بۆ چەند چرکە ساتێك سوپاسی زاتی بێ هاوتاو پاك بکەین و بڵێین، ئەی ئەو زاتەی کە سۆزو ئەوین و میهرەبانیەکەت، هەمیشە پێشکەوتووەو لە پێشەنگە، لە کاتی داواکردنی لێخۆشبوون، لە تاوانەکانمان و دەرچوون لە سنوری میهرەبانیت، کاتێك کە نزاکانمان بەرز دەبێتەوە بۆ لات، لێخۆشبوون و میهرەبانی و بەزەییت، شەرمەزاری بەر دەرگاکەتمان دەکات، ئێمە هەردەم هیواو متمانەمان بەتۆ زۆر بەرزە، بۆیە داوای یارمەتی و بەخشین هەر لە تۆ شیاوە، لە بەر ئەمەیە هەست و سۆزی ئێمە نایەوێت ببێتە هاودەم لەگەڵ هەست و سۆزی کەسانێك کە تۆیان فەرامۆش کردووە، خودایە گیان هەرچەندە دەزانین ئێمە گوناە بارین، کۆڵێك گوناهمان هەڵیگرتووە، بەڵام کاتێك دەبیستین و دەبینین بەخشندەیی و میهرەبانیەکەی تۆ بێ سنورە، ناتوانین بوەستین و داوای یارمەتی لە میهرەبانترین و بەخشندەترینی ئاسمان نەکەین، بۆیە داوات لێدەکەین، بە بەخشندەی و میهرەبانیە فراوانەکەت ئێمەش وەك بەندە دڵسۆزەکانت بخەرە ڕیزی دڵسۆزان، تاوەکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان دڵسۆزبین بۆ زاتی پاکت، وە لە نێو ئەم سنورەدا پارێزگاریمان لێبکە، تاوەکو دڵسۆزیمان، ئێمە بە پاکی بەخزمەتی زاتی پاکت بگەیەنێت .

# هونەری پەیوەندی هاوسەرگیری سەرکەوتوو

پارێزەر: شاهین خالید



زۆرن ئەوگەنجانەی کە هاوسەرگیری دەکەن بەڵام لەراستیا پێکەوە ناژین یاخوود پێکەوە دەژین بەڵام پەیوەندیەکی دروستی هاوسەرگیری نیە لە نێوانیاندا، یاخود پەیوەندی کردنی نێوانیان لەسەر ئەساسی گواستنەوەی وێنەی کەسایەتیان بووە بۆ ناو پرۆسەی هاوسەرگیری کە بەر لە ژیانی هاوسەرگیری بۆیان دروست بووە لە کۆمەڵگادا.

هاوسەرگیری بەرلە هەر شت پێوستە پەیوەندیەکی مۆڤایەتی سەرکەوتوو بێت کە تێیدا هەریەك لە هاوسەران هەڵگری ئێش و ئازارو چارەسەر بێت بۆ بەرەنگاربوونە وەی هەر کۆسپێك کە رێگر ئە بێت لە بنیادنانی ماڵێکی لێوان لێو لە ئارامی و بەختەوەری...گومانی تیدانیە هەموو گە نجیك هەوڵ دەدات بۆ بنیاد نانی خیزانێکی سەرکەوتو و بە ختەوەر ئەمش پیوستی بە ناسینی سایکۆلۆژیای رەگەزی بەرامبەر دە بێت بە پلەی یەکەم و پاشان فێربوونی هوونەری ئەتە کێت ومامەڵەکردن .

هیوادارین هەر گەنجێك یاخود هەرژن و مێردێکی بە رێز ئەم بابەتە دەخوێنێتەوە، هەوڵبدات ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکات و خۆشەویستی بکاتە کاڵای باڵای هاوسەرگیری و وە دوعاش جوانترین دیاری بێت بۆ هاوسەرەکەی بۆ کۆبوونەوەیان لە دونیادا بە خۆشی و لە دوا رۆژدا لە فیردەوسی باڵادا:

ئیمان کلیلی بەختەوەری هاوسەرانە: هەر کات پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودای گەورە پتە و دامەزراو بێت،ئەوا لەگەڵ هاوسەرەکەی و لەگەڵ هەموو گەردوندا بە هە مان شیوە ئە بێت.

هەوڵدان بۆ دروست نە بوونی بۆشایی سۆزو خۆشە ویستی:دروست بوونی بۆشایی سۆزوخۆشەویستی لە ناو خیزاندا ئەنجامەکەی گەڕان و پشکنین و دۆزینەوەی بە ناو خۆشەویستیەك دەبێت کە داهاتووی خێزان دەخاتە مەترسیەوە.

بوونی پلان بۆ ژیانی هاوسەرگیری:بەرەچاوکردنی بنەماو هەنگاوەکانی پلاندانان و تێگەییشتن لەسوودەکانی پلانی خێزانی لە پەرت نەبوونی تواناکان و هەنگاونان بەیەك ئاراستە و لەبەرچاوگرتنی ئەولەویات،رۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەسەر خستنی خێزاندا.

پەروەردەکردنی منالان و ئاراستەکرنیان بۆ ریزگرتن لە دایك و باوك: بۆ نمونەکاتیك منالَ دەگەرێتەوە بۆ ماڵ باوکەکە پێی بڵێت:کورم یان کچم سەلامت لە دایکت کرد! پێت وت هیجت پێویستە! ئەمە وا لە دایکەکە دەکات هەست بەوە بکات کە رێزی لێ دەگیرێ، هەمان شتت بۆ دایکەکە لەگەڵ مندالَکانی بجولێتەوە سەبارەت بە باوکیان.

رێزگرتن لە کەس و کاری یەکتری:سەرەرای بونی رێزو و خۆشەویتی و گرنگی دان بە بیرو بۆچون و هەستی یەکتری،کیبرکێ بۆ ریزگرتن لە کەس وکاری یەکتری یەکێکی تر دە بێت لەو خاڵە بنەرەتیانەی کەوا کەشتی خیزانی بەرەو کەناری ئارامی ئاراستە دەکات.

ئەنجامدانی کاری هاوبەش:یەکێك لەوشتانەی کە خۆشەویستی خیزانی بەردەوامی پێ دەدات کاری هاوبەشە لە نیوان ژن و مێردا بەتایبەت بۆ ئەو خێزانانەی کە کەمتر یەك دە بینن،بۆ نموونە کاتێك پیاو یارمەتی خیزانەکەی دەدات لە کاروباری ناو ماڵ لەلای خێزانەکەی خۆشەویستی زیاتر دە بیت بە پیچەوانەشەوە پیاو پێویستی بە پشتگیری خیزانەکەی دەبێت بۆسەرجەم کاروبارەکانی.....

ئەمانەی خرانە روو چەند رێسایەك بوون بۆ بەدیهێنانی پەیوەندیەکی هاوسەرگیری درووست ئەو ئامانجەی هەمووومان هەوڵی درووست بوونی دەدەین، جا پێویستە هاوسەران هەنگاوی زیاتر و زیاتر هەڵبگرن بۆ ئەوەی ئالای بەختەوەری بەردەوام شەکاوە بێت بەسەر ماڵەکانیانەوە، پەیوەندی دروست و خۆشەویستی خیزانی لە میوانی رۆژ و مانگ وساڵەوە ببێتە خاوەن ماڵ و ساتێکیش ئۆغر نەکات.

# پشووی بەرەو

زۆربەی کێشەکانمان دەرەنجامی دوو هۆکارە،
هەڵسوکەوت دەکەین بێ بیرکردنەوە، یان
بەردەوام لە بیرکردنەوەداین بێ رەفتارکردن.

ڕۆژێك دادێت شریتی ژیانمان نیشان دەدرێت،
هەوڵبدە ئەو شریتە شایستەی بینین بێت.

لوتکەی توندی و زبری دەرهەق بەخۆت ئەوەیە
بۆ ڕازیکردنی دەوروو بەرەکەت بژیت، ئەوانیش بۆ
شکاندنی هەموو شتە جوانانەکانی تۆ بژین.

ئافرەت وەك کارەبا وایە گەر پیاوەکەی بەچاکی بەکاری هێنا
ئەوا ژیانی پڕ دەکات لە ڕوناکی، گەر خراپیش بەکاری هێنا
ئەوا دەیگرێت و لەوانەیە لەناوی ببات.

لەیەکەم بینیندا حوکم بەسەر خەڵکیدا مەدە.

جیاوازیەك نیە لە نێوان ڕەنگی شەکر و
خوێدا، بەڵام دوای تاقیکردنەوە جیاوازیەکە
دەزانین، هەروەها مرۆڤەکانیش هەروان.

شۆخی و ڕێکپۆشی لە ڕوکەشدا خۆی نابینێتەوە،
بەڵکو ڕێکپۆشی ناوەکی هەیە کە لە ڕێکی زمان و
عەقڵ و دڵ و دەرون و شێوازدا خۆی دەبینێتەوە.



# کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو

ئا: کاروان کمال نریمان

تیۆری کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو، چاوپۆشی ناکات لەکەم وکوڕی وحەزوو ئارەزو، سەرکەوتنیشی بەدەستهێناوە لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەی کەجێبەجێیان کردووە، کەسەنەشیاوەکان جیادەکاتەوە، پۆستەکان بەپێی لێهاتوویی و بەهرەو توانا دەسپێرێت.

ئەم بیردۆزەیە ئەگەر هەر کۆمەڵگایەك چاك فێری ببێت و لێی تێبگات واتە شتەکانی لەجێگەی خۆی داناوە، سوود بەهەموو مرۆڤەکان دەگەیەنێت و بەگوێرەی شایستەیی کارەکان سپێردراوەو مافەکان پارێزراوە، وهەرکەس شایەنی سزابێت ڕێزی لێناگیرێت، بۆیە دەکرێت وەزارەت و دامودەزگاکان بەپێی بەپێوەری لێهاتوویی وبەتوانایی دابنرێت، بەهەماهەنگی وهاوکاری ولەگەڵ لایەنی پەیوەندی داردا، لەچوارچێوەی توێژینەوەی زانستی بەپشت بەستن بە ئەزموونە سەرکەوتووە نێودەوڵەتیەکان چاودێری بکرێت، تۆکمە بکرێت بەدەروازەکانی فێرکاری وبازاڕی کار، کۆکبن لەسەربنەمای شەفافیەت، هەلی باش بڕەخسێنرێت بۆ هاوڵاتیان بەیەکسانی، ئەوکات شکۆمەند دەبن و خەمخۆری نیشتیمان دەبن، کەئەمەمانای تەواوەتی فەلسەفەی دانانی کەسی شیاوە لەشوێنی شیاو.

ئەم پێوەرانە هەموو کەرتێکی گشتی وتایبەت کاری پێبکرێت. نەوەك پۆستێك بدرێت بەکەسێکی نزیك کەشایەنی نەبێت! لەو نێوانەشدا کەسی لێهاتوو دوربخرێتەوە!

لەگەڵ ئەوەشدا وەبەرهێنانی مرۆیی بەپێی جۆرو سەرچاوە کارێکە دەبێت دەوڵەت بایەخی پێبدات و لەپلانی گەشەپێدان دایبنێت.

هیچ جیاوازیەك نەکرێت لەگەڵ ئەوەی کە ناو دەنرێت بە (لادێی) و (شاری)، لێهاتوویی بکرێتە پێوەری چەسپاندنی دادگەری لەدابەشکردنی پلەو پۆستە حکومیەکان بەپێی داواکاری حکومەت بێت، لەهەمووی ترسناکتر ئەوەیە کە تیۆرەکە بەهەڵەونەزانی پیادەبکرێت، ئەگەر ئەسپەکە خراپ تاوبدرێت لەنەبوونی چاودێری داهەموومان چاودێربین هەرچاودێرێك بەرپرسە لەڕاسپاردەکەی ئەگەر ئەم پێوەرانە جێبەجێکران بەشێوەیەکی ئاشکرا بیردۆزەکە ڕەگدا دەکوتێت لەشادەماری کۆمەڵگەدا، ئاشوب وگەندەڵی کەم دەکاتەوە لەم سەردەمی زانستەدا دەبێت وەك مافێکی مرۆڤ بەردەوام دووبارە بکرێتەوە، پێویستە گفتوگۆی نیشتیمانی سازبکرێت هۆزگەری وناوچەگەری سنورداربکرێت و نەبێتە کۆسپی بەردەم یەکێتی نیشتیمانی، دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ڕۆڵیان هەبێت بۆ گەڕانەوەی شکۆمەندی وهاوسۆزی بۆنیشتیمان یەکێتی گەل پتەو دەبێت وباری ئەمنی جێگیر دەبێت، خزمەتکردن لەسەر هەمووان پێویستە مافی هەموانیشە کەلەخێرەکانی سوودمەندبین، نیشتیمان خۆشەویست بێت لامان.




# دوو ڕوو

لەم سەردەمی فیتنەیەدا کەسی وا هەیە نەك دوو ڕوو بەڵکو چەندان ڕووی هەیە و بەچەندین شێوە خۆی نیشانی خەڵك دەدات و خۆی دەنوێنێت.

ڕوو هەیە وەکو نورە، کەچی لەدوای نورەکەوە ئاگرە، هەیە بێدەنگە و دەبێت لێی بترسین، هەیە شارەزاو پسپۆڕە و دکتۆرای هەیە لەهەڵخەڵەتاندنی مرۆڤەکان، هەیە زمانەکەی ڕەنگێکە و کردارەکەی ڕەنگێکی تر، یان قسەی ڕەنگاو ڕەنگ دەکات و خۆشی ڕەش و سپییە، هەشە پەیوەندی بەهیچ شتێکەوە نییە و تاکە کێشەی تەنها قیامەتە..

بەگشتی هەموو جۆرە مرۆڤێك لەم سەردەمەدا دەستدەکەوێت، ئێمە لێرەدا باسی دوو ڕوو دەکەین.. کاتێك کەسێك یەکێك دەناسێت و دواتر بۆی دەردەکەوێت کە ئەو کەسە دوو ڕوو و موونافیقە، ویژدان و هەستی بەرامبەری ئاڵۆز و پەرت دەبێت، کەسانێکی تریش هەن کە ناتوانن بەرامبەرەکەیان بناسن و بگرە ڕەنگە ئەوانیش سیفاتی دوو ڕووەکان وەربگرن!

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی (نیشانەی " دوو ڕوو " سێ شتە، کاتێ قسەی کرد درۆ دەکات، کاتێ بەڵێنی دا نایباتە سەر، کاتێ سپاردەیەکی لا دانرا خیانەتی تێدا دەکات) صحیح البخاری، کتاب الإیمان، باب ٢٤، ژمارە ٣٤ و ٤٥٩ و ٣١٧٨. وصحیح مسلم، کتاب الإیمان، باب ٢٥، ژمارە ٥٩.

ئەم فەرموودەیە هەموو شتێکی براندەوە، خۆشەویست ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا وای فەرمووە و ئێستا ژمارە و ئامارییان زۆرتر و بەرزترە بەداخەوە..

خەڵك زۆرن کە قسەدەکەن و دەشڵەژێن و نازانن بڵێن چی هەتا درۆیەك دەکەن. زۆرن بەڵێن دەدەن و هەربیریان نامێنێ، گەر بیریشیان دەهێنیتەوە درۆیەکی تر دەکەن و یانیش قەرزدارت دەکەنەوە. زۆرن کاتێك سپاردە و ئەمانەتێکیان لادادەنرێ خیانەتی تێدا دەکەن و بەئارەزووی خۆیان دەستی لێ دەدەن و بیریان دەچێتەوە کە موڵکی خۆیان نییە و بۆیان نییە وا مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

خودایە! لەوانەمان نەژمێریت کە بەزمان بانگەشە بۆتۆ دەکەن و بەدڵانیش لێت دووردەکەونەوە، ئەی بەڕێزترین کەس لەلامان، نەمانکەیت بە بێڕێزترین کەس لەلای خۆت (اللهم امین). نزایەکی یەحیای کوڕی موعازی ڕازییە.

# قوتابی یەك و وەرزشوانێك




و: ئەمیر کۆیی



- لە یەکێك لە زانکۆکانی کۆلۆمبیا یەکێك لە قوتابییەکان ئامادەی وانەیەك بوو لە بابەتی بیرکاری، ناوبراولە پشتەوەی هۆڵەکە دانیشت و(بەئارامی خەوی لێ کەوت) لە کۆتایی وانەکە بە دەنگی قوتابی یەکان خەبەری بۆوە.. تەماشای تەختە ڕەشەکەی کرد بینی مامۆستاکەی دوو پرسیاری لەسەر نوسیوە بە خێرایی نوسییەوە و لە هۆڵەکە چووە دەرەوە و کاتێك گەڕایەوەماڵەوە دەستی بە بیرکردنەوە کرد بۆ شیکارکردنی ئەم دوو پرسیارە..

ئەو دوو پرسیارە زۆر گران بوون بۆیە ڕووی کردە کتێبخانەی زانکۆ و چەند سەرچاوە یەکی پێویستی وەرگرت.. دوای چوار ڕۆژ توانی پرسیاری یەکەم شیکار بکات..

قوتابیەکە لە ومامۆستایە زۆر بێ زار و دڵتەنگ بوو کە ئەم ئەرکە قورسەی داوە بەسەریاندا!!

بۆیە چوو بۆ لای و پێ گوت: ئەی دکتۆر چوار ڕۆژە خەریکی شیکارکردنی تەنها پرسیارێکم لە چوار لاپەڕەدا شیکارەکەیم نووسیوە..

مامۆستاکە وتی: ئەو دوو پرسیارەی کە لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسیبوم نموونە بوون بۆ قوتابیەکانم نووسیبو لەو پرسیارانەن کە زانست نەیتوانیوە تاکو ئێستا شیکاریان بکات!!

بێ گومان ڕازی بونی نەرێنی وای لە زۆرێك لە زانایان کردووە بیرنەکەنەوە تەنانەت لە هەوڵدان بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە..

ئەگەر ئەم قوتابی یە بەخەبەر بوایە و گوێبسیتی ڕاڤەکردنی دکتۆر بوایە بیری لە شیکارکردنی ئەم پرسایرە نەدەکردەوە. بەڵام ڕەنگە خەوێکی سوود بەخش بوبێت...

تاوەکو ئێستاش ئەم پرسیارە لە چوار پەڕاودا نمایش کراوە لە زانکۆکەدا.

## وەرزشوانێکی لێهاتوو

پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا بۆ چونێك هەبوو لە نێوان وەرزشوانانی ڕاکردن..

کە ئادەمیزاد ناتوانێك ماوەی میلێك ببڕێت لە کەمتر لە چوار خولەکدا..

وە هەر کەسێك هەوڵ بدات ئەو ژمارە ببەزێنێت ئەوا دڵی دەتەقێت!!

بەڵام یەکێك لە وەرزشوانان پرسیاری کرد ئاخۆ کەس هەوڵی داوە و دڵی تەقیوە، لە وەڵامی ئەواندا وتییان نەخێر کەس نەبووە؟؟

بۆیە دەست بە جێ دەستی کرد بەمەشق و ڕاهێنان تاکو توانی ژمارەکە ببەزێنێ ئەو ماوەیە ببڕێت لە کەمتر لە چوار خولەك..

لەسەرەتادا خەڵکی وایان زانی کابرا شێت بووە یان کاتژمێرەکەی دروست نییە بەڵام دوایی ئەوەی بینیان باوەڕیان پێ کرد و هەر لەو ساڵەدا زیاتر لە سەد وەرزشەوان توانیان ئەم ژمارە ببەزێنن؟؟

بێ گومان ڕازی بونی نەرێنی وای لێ کردبوون نەتوانن هەوڵبدەن، وە کاتێك ئەم قایل بوونە نەما توانیان داهێنان بکەن..



# بۆ ئەوەی خۆشەویست بین!

هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا هونەرێکی ناوازەیە، چونکە مرۆڤەکان جیاوازن لە سروشت و پێکهاتەو حەزو خولیایاندا. کارێکی سادەو ئاسان نیە هەروا رێزو خۆشەویستی خەڵکی بەدەست بێنین، بەڵام لە بەرامبەردا زۆر ئاسانە دۆستان و ئازیزانمان لە دەست بدەین بەهۆی هەڵەو کەمتەرخەمی خۆمانەوە، چونکە هەردەم روخان لە دروستکردن زۆر ئاسانترە.

گەر توانیت مامەڵەیەکی جوان و تەندروست بکەیت سەرەتا خۆت ئاسودەوخۆشحاڵ دەکەیت، هەست دەکەیت بەو هۆیەوە خەڵکی خۆشیان دەوێیت و حەز بە هاورێیەتی و دۆستایەتیت دەکەن، جا بۆ ئەوەی ئەم بەهرەیە بە دەست بێنین پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

١- چۆن حەز دەکەیت قسەکەرێکی باش بیت، لە بەرامبەردا هەوڵبدە گوێگرێکی باشیش بیت، ئەوانەی لە گەڵتا دەدوێن گوێیان بۆ شلکەو قسەیان پێ مەبڕە تا زنجیرەی بیرکردنەوەیان نەپسێت، بەم شێوەیە کەسەکە هەست بە متمانەو خۆشی دەکات و خۆشتی دەوێت.

٢- هەوڵبدە وشەو دەستەواژەکانت هەڵبژێرە جوانترین و ناسکترینیان بەکاربێنە، بابەتێك بۆ گفتوگۆکردن دیاری بکە کە بەلای دەورووبەرەوە بەسودو گرنگ و بایەخداربێت، خۆت لەو باس و بابەتانە بپارێزە کەمایەی بێزاری و نیگەرانیە، بزانەگفتوگۆکانت ئاوێنەو بەڵگەی کەسایەتیتە.

٣- هەوڵبدە روخۆش و لێو بەخەندەبیت، ئەمە وادەکات لای خەڵکی پەسەند بیت تەنانەت لای ئەوانەشی کەباش ناتناسن، چونکە بزەو روخۆشی رێگای خۆی دەکاتەوە بۆ نێو ناخودڵ و دەروون.

٤- هەوڵبدە جەخت لەسەرشتە جوانەکان بکەیتەوە، گەر کەسێك هەڵەو کەموکورتیەکی هەبوو ئەوا ناراستەوخۆو بە نەرمونیانی لەگەڵیدا بدوێ وەك ئەوەی باسی کەسێکی تر دەکەیت، ئەوکات کەسەکە لەناخی خۆیدا بەراورد دەکات و لە وتەو ئامۆژگاریەکان تێدەگات و بە خۆیدا دەچێتەوە.

٥- بەپێی توانا هاوکاری و یارمەتی کەسانی تر بدە، بەتایبەت ئەوانەی داوای یارمەتیت لێدەکەن، خۆت بە دوور بگرە لە فەرمانکردن بەسەر کەسانی تردا چونکە رەفتارێکی بێزراوو نەشیاوە.

٦- هەوڵبدە گاڵتەو سوعبەت کردن کەم کەیتەوە، چونکە کەسایەتی و پێگەت دەروشێنێت، ئەمەو سوعبەتکردن لای هەموو کەسێك مایەی قبوڵ نیە، ئەمەو دەشێت لەکاتی گونجاودا سوعبەت بکەیت.

٧- لەمامەڵەو هەڵسوکەوتەکانتدا روون و ئاشکرابە، خۆت بەدووربگرە لە دووڕوویی و رەنگاو رەنگی، هەرچەندە سەرکەوتنی کاتی بەدەست بێنیت بەڵام رۆژێك دێت ئاشکرا دەبیت و ریسەکەت دەبێتەوە بەخوری.

٨- بە پێی ئاست و بەهرەو توانای خۆت هەڵسوکەوت بکە، گەر لە ئاستی هەندێك کەسدا نەبووی شەرم مەکە چونکە ئەمە نەنگی نیە، شورەیی ئەوەیە کراسێك بپۆشیت هی خۆت نەبێت یان بۆت نەشێت.

٩- رێز لەکات بگرەو پابەندبە بە وادەو بەڵێنەکانتەوە، بەوە رێز لە بەرامبەر دەگریت و ئەویش رێزت لێدەگرێت.

١٠- کاتی گونجاو هەڵبژێرە بۆ سەردان و میوانداری و بەرامبەرەکانت نیگەران مەکەو پلان و بەرنامەیان مەشێوێنە.

١١- خۆت بە دوور بگرە لە هەڵسوکەوتی حەرام و ناشیرین وەك ئاژاوەگێری، غەیبەت، دووزمانی ..... هتد.

١٢- کەسێکی رەوشت بەرزو بێ فیزو سادەبە، بەوە متمانەو خۆشەویستی بەدەست دێنی.

١٣- بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانت خەڵکی نیگەران و وەڕس مەکەو زۆریان لێ مەکە باوا نەزانن بۆ بەرژەوەندی کەسی هاورێتیان دەکەیت.